# دیوانی حەریق

مەلا سالحی کوڕی مەلا نەسروڵڵای زەنگەنە



لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە

نەوزاد کەلهوڕ

التفسير

# دیوانی حەریق

## مەلا ساڵحی کوری مەلا نەسروڵڵای زێوەییە

لێکۆڵینەوەو  لێکدانەوەی
نەوزاد کەلهور

| | |
|---|---|
| نـــــــاوی کتێـــــــب: | دیوانی حەریق |
| لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی: | نەوزاد کەلهور |
| چـاپ و بڵاوکـردنەوەی: | نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/هەولێر |
| نەخشەســــازی ناوە: | شنۆ حمدامین |
| خــــــــــــەت: | نـــەوزاد کۆیـــی |
| بـــــــــــەرگ: | ئەمیـن مخـلـص |
| نۆرە و ساڵی چـــاپ: | یەکەم ١٤٣٢ک – ٢٠١١ز |
| تــــیـــــراژ: | ١٥٠٠ دانە |

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردن (٨٠٨) ساڵی٢٠١١ پێدراوە

نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر تونێلی شیرین پلاس

www.tafseer-pub.com
tafseeroffice@yahoo.com
Mob:0750 460 61 22
Tel: 066 25 18 138

# پێشەکی

حەریق ناوی مەلا سالح کوڕی مەلا نەسروڵڵای زێوییە، زێویە دێیەکە لە سورداش لە ناوچەی سلێمانی، پاڵی داوە بەلای رۆژهەڵاتی کێوی پیرەمەگرونەوە، مەلا نەسروڵڵای باوکی خەڵکی دێی کاشتەرە، کاشتەر و لۆن دوو دێن پاڵیان داوە بە کێوی شاهۆوە، کە کەوتووتە نێوان هەورەمانی لوهون و جوانرۆوە، مەلا نەسروڵڵا بە فەقێیەتی وڵاتەکەی خۆی بەجێهێشتووە لە پاشان بە مەلایەتی لە دێی زێویە گیرساوەتەوە و ژن دێنێ.

حەریقی شاعیر لە ساڵی ١٨٥١ز لە دێی زێوە لە دایك بووە، سەرەتا خوێندنی فەقێیاتەی لەلای باوکی دەست پێ دەکات پاشان دەچێتە سلێمانی و لە مزگەوتی شێخ مەحمەدی بەرزنجی درێژە بە خوێندن دەدات، پاشان دەچێتە قەرەداغ، لە بیارەش باسی (نیکاح) لە کتێبی (منهاج)ی نەوەوی لای شێخ حەیدەر دەخوێنێ، جارێکی دیکەش دەگەڕێتەوە سلێمانی و دوایش دەچێتە پێنجوێن (گەلنبەوی) لە زانستی مەنتیق دەخوێنێ لای مەلا عبدالرحمن ی پێنجوینی لەوێوە دەچێتە موکریان، ماوەیەکیش لەو ناوەدا بە فەقێیەتی دەسورێتەوە، پاشان رێگای دەکەوێتە خانەقای (شێخ بورهان) و لەوێوە دەکەوێتە داوی تەریقەتەوە و تەریقەت لە (شێخ یوسف شمس الدین) (شێخ بورهان) وەردەگرێت، پاش تەواوکردنی خوێندن دەبێتە مەلایەکی زانا و پایەبەرز و دەچێتە گوندی (ساحیب)ی ناوچەی سەقز و دەبێت بە مەلا و مودەریسی ئەو دێیە هەر لەوێش ژن دێنێت و خەریکی وانە گوتنەوە دەبێت.

لێکۆڵینـەوە لـە ژیـانی و شـیعری شـاعیرانی کلاسـیکی کـارێکی ئاسـان نییـە، لەبەر ئەوەی گەلێك شـتی سـەیر و سـەمەرە تێکـەڵ بـە ژیانیـان کـراوە، خـودی شاعیرانیش نەیانکردووە بە خـوو ژیـانی خۆیـان بنووسـنەوە یـاخود هـەر هـیچ نـەبێت لـە دامـێنی هۆنراوەکانیـان مێـژووی دانـانی شـیعرەکانیان بنووسـیبایە ئـەوەش دەبـووە یارمەتیـدەرێکی بـاش بـۆ لێکۆڵـەرەوە، ئـەوەی بـۆ ئێمـەش ماوەتـەوە هەنـدێك دەستنووسـە لـە کاتـێ خـۆی شـیعر دۆسـتان نووسـیویانە، ئـەوەش کـە ماوەتـە لەبـەر بـێ خزمـەتی یـاخود لـە دەلاقـە و پەنجـەرەی مزگەوتەکان یاخود گـەورە مـاڵان ماوەتـەوە و دلۆپـە لێـی داوە و یـاخود لەبـەر کۆنی پەڕەکانی رزیوون بە ئاسانی ساغ نابێتەوە.

دیوانی حەریق هەتا ئێستا سێ جار چاپ کراوە، جاری یەکـەمییان لەلایـەن کوردی مەریوانیەوە و لـە سـاڵی ١٩٣٦ لـە بەغـدا چـاپکراوە، کـە دەبێـت ئـەرك و ماندووبوونی کوردی بـە هەنـد وەربگـیرێ، چونکە توانیویـەتی ئـەو دیوانـە لـە فەوتان رزگار بکات، دڵنیام ئەگەر ئەوان نەبوونایە بەشێکی دیکەی شـیعرەکانی حـەریق لـەناو دەچـوون و نەدەگەیشـتنە دەسـتمان لـە هـەمان کاتیشـدا دەبێـت ئـەوەش بگوترێـت سـەردەمی شـاعیر کـە تێیـدا ژیـاوە لەگـەڵ لەچـاپدانی شیعرەکانی حـەریق جیاوازییـەکی زۆر نیـە لـە نێوانیـان نزیکـەی سـی سـاڵێك دەبوو، ئەگەر هەوڵی زیاتریان بدایە دڵنیام شتی راستر و دروستر لەسـەر ژیـانی ئەو شاعیرە بەدەست دەکەوت هـەروەها بەرهـەمی زیـاتری ئێسـتا لـە بەردەسـت دەبوو.

چـاپی دووەمـی هۆنراوەکـانی حـەریق لەلایـەن مـەحموود خـاکی، چـاپی دووەمـی لەشاری کـەرکوك و لـە چـاپخانەی (الجمهوریـە) چـاپ کـراوە لەگـەڵ پێشـەکیەك لەلایـەن محەمـەد محەمـەد رەشـید نووسـراوە، کـە ئـەویش بـە

دەستکاری کورتکردنـەوەی لـە کتـێبی (مێـژووی ئـەدەبی کـوردی) مامۆسـتا علاالدین سجادی وەرگیراوە لەگەڵ پێشەکی دیوانی حەریقی چاپی ساڵی ١٩٣٨

ئەو چاپە هۆنراوەکانی بە پیتی ئەبجەدی ریز کردووە لە هەندێك شوێنیش هەندێك وشە لێکداوەتەوە وشەکانیش خوێنەری ئاسایی مانایان دەزانیت.

چاپی سێیەمی هۆنراوەکانی حەریق کە چەند هۆنراوەیەکی زیاتری لـە خـۆ گرتـووە کـە لـە چـاپی کەرکوکـدا نیـە، ئـەو چاپە لەلایـەن سـەید نەجمـەدین ئەنیسی لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە، لە بڵاوکراوەکانی (محەمەدی سـەقز)یـە لـە ساڵی ١٣٦٨ی هەتاوی لە چاپ دراوە لە شاری مەهاباد.

سـەید نەجمـەدین ئەنیسی لـەو چاپـەیدا هەستاوە هەنـدێك لـەو کەسانەی وتـار یـان بابـەتیان لەسـەر حـەریق نووسـیوە، ئـەو کـۆی کردۆتـەوە لەگـەڵ دیوانەکـەدا بـڵاوی کردۆتـەوە (وەکـو پێشـەکیەکەی عـلاء الـدین سـجادی لـە مێژووی ئـەدەبی کـوردی، شـیعر و ئـەدەبیاتی کوردی، رەفیـق حلمـی، باخچەی شاعیران عبدول عزیم ماوەتی و عەبدلقادر ساڵح، حـەریق ئـەدەب و تەسـەوف، جمال محەمەد لە گۆڤاری سروە، نووسراوی هێمن.

جگە لەوانەش لێکۆڵەرەوە سەید نەجمەدینی ئەنیسـی هەسـتاوە ناونیشـانی بۆ هۆنراوەکان داناوە جا نازانم ئەوەی لە خۆوە بووە یاخود ئەو دەستنووسـەی پشتی پێوە بەستووە، ناونیشانی بۆ هۆنراوەکانی داناون ئەو لەلایەك، لەلایـەکی دیکەوە پەیڕەوی ڕێزبەندی هۆنراوەکانی نەکردووە بـە پیـت، بـەڵکو تێکـەڵاوی کردوون من بەش بە حاڵی خۆم نـازانم چـۆن چـۆنی هۆنراوەکـانی ڕێکخستووە لەسەر چ بنچینەیەك!

وە ئەگەر بێت و بەراوردێك لە نێوان چاپەكەی كەركوك و مهاباد بكەین دەبینین لە هەندێك شوێندا جیاوازی بەرچاو دەكەوێت لە هەندێك وشە و هەروەها چوارین تێكەڵ بە هۆنراوە كراوە.

من لام وایە كۆمەڵێك شتی سەیر و سەمەرە تێكەڵ بە ژیانی حەریق كراوە، كە ئەو شتانە زیاتر لە ئەفسانە دەچن، بۆ نموونە سەید نەجمەدینی ئەنیسی دەڵێت (حەریق كاتێك لە دێیی قاراوەی ناوچەی بۆكان خەریكی مەلایەتی و دەرس گوتنەوە دەبێت و هەر لەم ئاوایی بە هۆی هۆنینەوەی چوارینەیەك ساڵح خانی ئیعزامۆل موڵك ئاغای قاراوا كە كەسێك و پیاوێكی ساماندار و خاوەن دەسەڵات و دەست ڕۆیشتوو بووە ریشی دەتاشێت[١]. هەروەها هێمن دەڵێت (نازانم لە كوێ بەڵام لەسەر شیعرێك ئیمزامۆل مولك فیئودالی مەشهور ریشی لوس تاشیووە، ئەوە بۆتە هۆی ئەوەی ببیتە سابلاغ و ببێتە مەلای مزگەوتی حاجی سەید حەسەنی خزمی خۆم[٢]، هەروەها د. مارف خەزنەدار (دەڵێت جارێكییان بەشیعرێك یەكێ لە كوڕەكانی شێخ عوسمانی تەوێڵە دادەشۆرێنی، ئاغای دێیەكە ناوی ئیمزامۆلرلك بووە بۆ ئەتك ریشی تاشیووە)[٣].

من پێم وایە ئەو سێ كەسەی ئەو بەسەرهاتەیان گێڕاوەتەوە سەرچاوەكەی یەك سەرچاوەیە، بەڵام نازانم كامیان لە كامیان وەرگرتووە، چونكە هیچ كامێكییان دەستنیشانی سەرچاوەیان نەكردووە كە لە كێوە ئەو قسەیان وەرگرتووە لەلایەك و لەلایەكی دیكەوە قسەكەی سەید نەجمەدینی ئەنیسی كە

---

(١) دیوانی حەریق، لێكۆڵینەوەی سەید نەجمەدینی ئەنیسی، چاپخانەی مهاباد، لاپەڕە٢

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٦٥

(٣) د. مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی كوردی، بەرگی چوارەم، دەزگای ئاراس، لاپەڕە ٤٥٠

دەڵێت بەهۆی هۆنینەوەی چوارینەیەك لای هێمن كە دەڵێت لەسەر شیعرێك، ئێمە نازانین ئەو شیعرە یا ئەو چوارینە كامیە!

كە ئعیزامومولك ئەتكی كردووە وە هەروەها لە چوارینە بۆ كێی گوتووە!

كاتێك (د. مارف)یش دەڵێت بە چوارینەیەكی یەكێك لەكوڕەكانی شێخ عوسمانی تەوێڵەی داشۆریوە ئێمە دەڵێن كامە چوارین و كام لە كوڕەكانی شێخ!

كاتێك خوێنەر دیوانەكەی حەریق دەخوێنیتەوە هیچ شیعرێك یاخود چوارینەیەك بەرچاو ناكەوێت كە بۆنی ئەوەی لێ بێت هێرش كرابێتە سەر كەسێكی ئەوتۆ كە ئەو كارەی بەرامبەر ئەنجام درابێت نەخوازەللا كەسێكی وەكو بنەماڵەی شێخ عوسمانی تەوێڵە، چونكە هەمووومان ئەوە چاك دەزانین كە حەریق سۆفی شێخ بورهان بووە، ئەویش خەلیفە و ڕێگاپێدراوی شێخ عوسمان بووە، كەواتە ڕێگای تێ ناچێت حەریق كارێكی ئەوتۆی ئەنجام دابێت، وە ئەگەر بگەڕێینەوە ڕەهەندە مێژوویيەكەی سەردەمی حەریق كۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتایی سەدەی بیستەم پیاوانی ئاینی بە تایبەتی مەلا پلەو پایە و شوینێكی دیاریكراوی كۆمەڵایەتی دیار و بەرچاوییان هەبووە و شانیان لە شانی ئاغا و دەرەبەگ داوە یاخود بە مانایەكی دیكە بڵێین بنكەی جەماوەری خۆیان هەبووە، بۆیە كارێكی ئەوها ئاسان نەبووە ئەو ئەتكەی پێ بكرێت.

هەروەها د. مارف خەزنەدار دەڵێت (حەریق ئاشنایەتی لەگەڵ شێخی بورهان شێخ یوسف شمس الدین پەیدا دەكا و لە خانەقای ئەو دەمێنێتەوە و ئیجازەی تەریقەتی نەقشبەندی لە شیخی بورهان وەردەگری، ماوەی ژیانی

ساڵح لە خانەقا وەك ساڵێكێك بووە ساڵێك نابێت ژن بهێنێت، بەڵام ئەو بەدزی ژنی هێناوە، لەبەر ئەوە شێخ لە خانەقا دەری كردووە[١].

هێمن دەڵێت: حەریق لەخانەقا ماوەتەوە، لە كن شێخ ماقوڵ بووە، خەڵك ڕێزی لێ گرتووە، تا بۆتە مامۆستای تایبەتی كوڕەكانی شێخ، بەڵام هەوەسی پیاوانە و تەبعی شاعیرانەی حەریق ئۆقرەی لێ بڕیوە، نەیتوانیوە وەك سەید ڕەشید و مام سیف و مەلا حوسین و مام جەعفەر دیار مەمەد و كاكی شفەلی و مەحمود دوشا و وە دەیانی تر تا مردن بەڕەبەنی بژی و بێ ژن و هاوسەر هەڵكا، بەدزی شێخ ژنی هێناوە و ماڵی پێكەوە ناوە، دوژمنان لە هەموو دەور و زەمانانـدا هەن، ئەم خەبەرە بە گوێی شێخ گەیشتووە و حەریقی لەخانەقا دەركرووە[٢].

دیارە حەریق زانایەكی ئاینی بووە، دەبێت ئاگاداری ئەوە بووبێت ژن نەهێنان لە ئیسلامدا نیە، نەك هەر ئەوەندە بەڵكو ژنهێنان یەكێكە لەسوونەتەكانی پێغەمبەر(ﷺ) كەواتە ناكرێت كەسێكی وەكو حەریق كە هیچ بیانووییەكی نیە و ژن نەهێنێ، هەروەها كەسێكی لەخواترسی وەكو شێخ یوسف شمس الدین چۆن دەبێت پیاوانی خۆی لەسەر ژنهێنان لە خانەقا دەربكات! بەگوێرەی سونەتەكانی ئیسلام دەبێت شێخ هاندەری ژنهێنان بووبێت، نابێت ئەوەش لە بیر بكەین كە شێخ یوسف شمس الدین زیاتر لە ژنێكی هەبووە.

پێغەمبەر(ﷺ) هانی لاوەكان دەدات و دەفەرموویێت: (یا مَعْشَر الشَباب من إستطاع الباءە فَلیَتزوج فانه أغض البصر وأحصن للفرح، ومَنْ لمْ یستطیع فعَلَیهِ

---

(١) د. مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی كوردی، بەرگی چوارەم، دەزگای ئاراس، لاپەڕە ٤٥٠

(٢) سەید نەجمەدین ئەنیسی، دیوانی حەریق، چاپی مهاباد، لاپەڕە ٤٨.

بالصَوم فانه له وجاء) [١].

هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکە دەفەرموویت (یا مَعشَرَ الشَباب مَنْ إستطاع منكم الباءه فليَتزوج، ومَنْ لم يستطيع فعليهِ بالصوم، فانه له وجاء) [٢]. دیسان لـە فەرموودەیـەکی  دیکـەدا دەفـەرموویت: (جـاء ثلاثـة رهـط إلى بيـوت أزواج النبي(ﷺ) يسألون عـن عبـادة الـنبي(ﷺ) فلمـا أخـبروا كـأنهم تتالوهـا، فقـالوا: وأيـن نحـن مـن الـنبي(ﷺ)؟ قـد غَفَـرَ لـه مـا تقـدم مـن ذنبـهِ ومـا تـأخر، قـال أحدهم: اما انا فأني أجلي الليل أبدا، قال آخر: أنا أصوم الـدهر ولا أفطـر، وقـالَ آخر: أنا أعتزل النساء فلا أتـزوج أبـداً، فجـاء رسـول الله(ﷺ) فقـال: أنـتم الـذين قلـتم كـذا كـذا؟ امـا والله انـي لأخشـاكم لله وأتقـاكم لله وأتقـاكم لـه، لكـني أصـوم وأفطر، وأصلي وأرقد، وأتزوج النساء، فمن رغب عن سنتي فلَيْسَ مني) [٣].

حــەریقی شــاعیر لــە مــاوەی ژیانیــدا، ژیــانێکی ســوفیانە و هەژارانــەی رابـواردووە بـە بەڵگـەی ئەوئـەی جارێـك داوای گوێدرێـژ لـە مـەلا ئەحمـەدی لاسور ئەکا، دیارە ئەویش نایداتێ، کەواتە شاعیر خاوەنی گوێدرێژیش نەبووە.

لە عوزرا بوو مەلا بۆیـە جـوابی دا وتـی نایـدەم
وولاخ دەس ناکەوێ چش، سا چاکە هەر پیـادەم

شاعیر لە ساڵی ١٩٠٧ لە شاری مهاباد و لـە تەمـەنی ٥١ سـاڵیدا کۆچـی دوایـی دەکات و لە گۆڕستانی مەلا حاجی دەنێژرێت.

(١) صحيح البخاري، للإمام أبي عبدالله البخاري، دار صادر، الطبعة الأولى، ٢٠٠٤م، ص٩٣٢
(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو.
(٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

## هونەری شیعری حەریق

حەریق یەکێك بووە لە شاعیرانی کلاسیکی لە کوردستانی باشوور، هەروەکو هێمنی شاعیریش دەڵێت حەریق یەکێك لەو شاعیرانەی باشوور کە توانی شیعری کلاسیکی کوردی باشور بگوازێتەوە بۆ کوردستانی رۆژهەلات و یاخود نوێنەری شیعری کلاسیکی کوردییە لە کوردستانی رۆژهەڵات.

شاعیر بەوپێیەی شاعیرێکی کلاسیکییە پەیڕەوی ئەو رێبازەی کردووە لە رووی کێشەوە، زۆربەی شیعرەکانیشی لەسەر کێشی هەزەجە کە رەنگبێت زۆربەی شاعیرانی کلاسیکی کوردی لەو بەحرە هۆنراوەی زۆریان گوتبێت، هەروەها شاعیر لە رووی کێشەوە پەیڕەوی شیعری کلاسیکی کردووە، هەموو شیعرەکانی یەکێتی قافیەی تێدایە.

بەلام دیسانەوە گەر سەیری دیوانەکەی بکەین هەموو پیتەکانی زمانی عەرەبی تێدایە نیە، هەروەها پیتەکانی کوردی کە بریتین لە (پ، چ، ژ) بەرچاو ناکەوێت.

گەرچی حەریق تەمەنێکی زۆری نەبووە، هەمووە٥٦ ساڵ ژیاوە، بەلام گەر بەراورد بکەین تەمەنی لەگەڵ شیعرەکانی کەم دێنە بەرچاو، رەنگبێت بەرهەمێکی زۆری فەوتا بێت نەگەیشتبێتە دەست ئێمە، لێکۆڵەرەوەکان باس لەوە دەکەن حەریق بەزمانی کوردی و فارسیو عەرەبی هۆنراوەی گوتوە، دیارە ئەوەش بەدوور نازانرێت، چونکە شاعیرانی سەردەمی حەریق و پێش ئەویش زمانی عەرەبی و فارسییان زانیوە ئەوەش لە رێگای پڕۆگرامەکانی خوێندیناوە لەلایەکی دیکەشەوە شاعیرانی هاوچەرخی ئەو شیعرییان بەو سێ زمانەوە گوتووە و جار جاریش بە زمانی تورکیش هۆنراوەیان هۆنیوەتەوە،

بەڵام بەداخەوە حەریق جگە لە زمانی کوردی هیچ بەرهەمێکی بە زمانەکانی دیکە لەبەردەستی ئێمەدا نیە.

گەر بێت و شاعیر بەراورد بکەین لەگەڵ شاعیرانی سەردەمەکەی خۆی ئەوە بەرچاو دەکەوێت لە وشەکانی حەریق سوکتر و ئاسانترن لە شاعیرانی دیکە کەواتە دەتوانین بڵێین ئەوەی شاعیر لە ئەوانی دیکە جیا دەکاتەوە ئەوەیە ئەو وشانەی ئەو بەکاریهێناوە سوکترن لە شاعیرانی دیکە.

من لام وایە کە چ شاعیرێك هێندەی حەریق لە (نالی)یەوە نزیك نەبووە، یاخود بە مانایەکی دیکە بڵێم شیعری حەریق لە هەموو شاعیرەکانی دیکە زیاتر بۆنی شیعری نالی لێوەدێت رەنگبێت ئەوەش جۆرە شانازی کردنێك بەخۆی کە دەتوانێت وەکو نالی شیعر بڵێت.

بۆ نموونە نالی دەڵێت:

ئەی تازە جەوان! پیرم و ئوفتادە و کەوتووم
تا ماوە حەیاتم
دەستی بدەرە دەستی شکستەم کە بەسەرچووم
قوربانی وەفاتم
تۆ یوسفی نەو حوسنی لەسەر میصری جینانی
من پیرم و فانی
لەم کولبەی ئەحزانە زیندووم و نەمردووم
هەروا بە تەماتم[1].

---

(١) دیوانی نالی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەریس و فاتح عبدالکریم

حەریقی شاعیر لە غەزەلێکدا لەسەر کێشی ئەو شیعرەی نالی دەڵێت:

ئەی حضری ڕەهی روحت ساکینی قـەعری زوڵمـاتم
سـەرمایەی سـەودا کـە دەڵـێن زوڵفـی دونایـە
هەرپێچشـی تـاییکی صـەد ئاشـووبی تیایـە
بیـدە بـە دڵـم، شـیفتە بـۆ شـیفتە چـاکە...
بیخـەملم، ئـەو قەیـدە بـە دێوانـە ڕەوایـە[1].

حەریق دەڵێت:

ئـەی خضري ڕەهـی زولمـەتی نێـو ئـاوی حـەیاتم
بـێ شەمسـی روخـت سـاکینی قـەهری زوڵمـاتم
ئەفسـوردەیی سـەرمایی حـوزورز شـەهواتم
ڕەنجیـدەو ئـازوردەیی دەسـتی خەتـەراتم

ئەو کاتەی ئەحمەد پاشای بابان میری بابانەکان بووە لە شاری سلێمانی، بـە پێویستی زانیووە دەستەیەك لە سەربازی هەبێت بۆ پاراستنی ئـەمارەتی بابـان، بۆیە هەستاوە بە ڕێکخستنی سوپا کە لەلایەن گەنجانی ئـەو شـارەیێك هـاتبوو، نالی گەلێك بەو تاقمە مومتازە دڵخۆش دەبێت و دەڵێت:

ئـەم تاقمـە مومتـازە کـەوا خاسـیەیی شـاهن
ئاشـووبی دڵـی مەملەکـەت و قـەلبی سـوپاهن
سەف سەف کە دەوستن بە نـەزەر خـەتتی شـوعاعن
حەلقەکـە دەبەسـتن وەکـو خەرمانـەیی مـاهن

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

حـەریق هەسـتاوە لەسـەر هـەمان کێش و قافیـە بـۆ قوتابیـانی قوتابخانـەی ڕوشدیە هۆنـراوەیەکی نووسیوە کە شان بە شانی نالی دەدات:

ئەم تاقمە شـیرینە لـە مەکتـەب کـە دیـارن
جـــەللادی دڵـــی عالـــەم و ئاشـــووبی دیـــارن
شیرین سەنەم و دڵبــەر و فــەتتان و عــەیارن
خاڵی لە خەلەل جوملە وەکو نەقــدی عــەیارن

حەریق هەر بەوەندە نەوەستاوە، بـەڵکو لـە قەسـیدەیەکدا بەرپەرچی نـاڵی دەداتەوە عەشقی مـەجازی ڕەت کردۆتـەوە، قەسـیدەکەی نـاڵی لەسـەر بـەحری (هەزەج)ە، ناڵی لەو قەسیدەیە ستایشی کچ دەکات، بـەڵام بـە پێچـەوانەی نـاڵی، حەریق ستایشی کوڕ دەکات.

ناڵی دەڵێت:

عیشقت، کە مەجازی بێ، خواهیش مەکە ئـیلا کـچ
شیرین کچ و، لەیلا کچ و سـەلما کـچ و عـەزرا کـچ
فەرقی کوڕ و کچ ڕوشن، وەک فەرقی مەه و میهرە
ئەم فەرقی شەو و ڕۆژە وەک فەرقە لە کوڕ تا کچ

وەڵامەکـەی حـەریق لەسـەر هـەمان کێشـی هەزەجـە، لـە ڕووی ناوەڕۆکـەوە پێچەوانەی (ناڵی)یە کە کچی کردووە بە عەشـقی مـەجازی و کوڕیش عەشـقی حەقیقی.

حەریق دەڵێت:

عیشقت کـە حـەقیقی بـێ تالیـب مەبـە ئـیلا کـوڕ
هەم حـــەزرەتی لـــەولا کـــوڕ هـــەم یوســـفی والا کـــوڕ

ئەو نورە کە مەنشەءبوو بۆ عاشقی مەبدەءبوو
تێفرکە لە ئەو نوورە مەعلوم و هووەیدا کورٍ
عێشقێ کە بە قووەت بێ مائیل بە مرووەت بێ
نەمدیوە کە تاڵیب بێ ئیلا کە تەڵەب کا کورٍ

لە سەرەتا هۆنراوەی ئومێدا بە شیعری دڵداری دەستی پێ کردووە، کاتێك دەگاتە خانەقای شێخ بورهان ئاراستەی شیعری دەگۆڕێت بەرەو سۆفیزم، ئیتر پشت لە لایەنەکانی دیکەی شیعر دەکات و تاوەکو رۆژی کۆچی دوایی کردنی خۆی یەکلا دەکاتەوە بۆ شیعری ئاینی و سۆفیزم، بەڵام ئەوەی تێبینی دەکرێت کەم بەرچاو دەکەوێت هۆنراوەیەکی ئاینی بۆ کەسێك گوتبێ، بەڵکو لەناو هۆنراوەکەدا باسی لە گەورەیی و خۆشەویستی کەسانێك دەکات وەکو خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) و شێخ بورهان.

شاعیر شانازی بە خۆیەوە دەکات هاتۆتە مەیدان کە کێ دەتوانێت شان لە شانی بدات:

بێرەمەیدانی فەساحەت ئەسپی خۆت لێگدە حەریق
تا بزانم کێ بە شیعرت سوحبەت و یاری ئەکا؟

هەروەها لە رووی رەوانبێژییەوە حەزی لە جیناس و وشە ئارای کردووە وەکو:

هەوری خەفەتە بەفری غەمی داوە بەسەرما
یا سەرسەری دوریتە کە لێی کردمە سەرما
گاهێ بە شەرارەی غەم و گەهـ سەرسەری هیجران
خۆشی نەبوو بۆ من نە بە گەرما نە بە سەرما

لە نێوان هەردوو (سەرسەر) یەکەم و دووەم و (بەسەرما) یەکەم و دووەم جێناس هەیە لە نێوانیان.

یاخود:

مەنوارە بە ظاهر کە بەبێ قووتم و رووتم
رووتی و قووتی خەیاڵت غەزەلی چاکە لە بەرما

هەروەها:

حوزنی من و حوسنی تۆ ئەشکالە تا ئاخر نەفەس
بوچ زەکاتی حوسنی تۆ یا حوزنی من ناگا بە کەس

لە رووی تەشبیهەوە شاعیر دەڵێت:

برهان وەکو کەنعان شەرەف کەند لەمصر بوو
کردت بە مەدینەی ئەمەل و کەعبەی غایەت

لە نێوان بورهان و کەنعان هەروەها شەرەف کەند و مصر، هەروەها لەف و نەشردا دەڵێت:

چۆن ئەکەی مەنعی دڵی من تۆ لەشەهدی لێوی خۆت
لێوی تۆ وەک شەکرستان و دڵی من وەکی مەگەس

هەروەها :

قوریت سبەبی بوعدە لە یار و لە دیارم
رازیم بە جەف گەر وەفاییە دیارم

لە رووی تەناسوبەوە شاعیر دەڵێت:

خودا عومرت بدا باقی وەرە ساقی بدە راقی
کە تۆ هەمرازمی مەی بێنە تۆ دەرمانی دەردانم

# پیتی (أ)

بەناوی خوای گەورە

عاشقی سەر و قەدت قومری صفت زاری ئەکا
رووی گوڵی تۆ بلبلی دڵ فێری غەمخواری ئەکا[١].
خۆت وەکو سولطان و چاوت حاکم و بڕۆت شمشێر
تیری مژگانت وەزیرە مەشقی خونخواری ئەکا[٢].
کەوتە نیو ظلماتي زوڵفت دڵی ئەسکەندەرم
خضري زیندە ماچی لێوت دێ رزگاری ئەکا[٣].

---

(١) قومری= کوکوختی باڵندەیەکە وەکو کۆترە، زاری ئەکا=ناڵە و گریان واتە هەر کەسێك عەشقی سەروی قەد و باڵای تۆ بێت، قومری ئاسا هەردەم ناڵە و گریانیەتی، دەم و چاوی تۆ وەکو گوڵ وایە، هەر کەسێك ببینێت دڵی بۆت دەچێت هەردەم غەم دەخوات و کاتێك لێت دوور بکەوێتەوە.

(٢) خۆت وەکو سوڵتانی فەرمان دەردەکەی، چاوەکانیشت هەروەکو حاکم وانە بڕیار دەردەکەن وبرۆکانیشت شمشێرە فەرمانەکانی چاوت جێبەجێ دەکات، مووی برژانگەکانیشت وەکو وەزیرن فێری خوێنڕشتنیان دەکات.

(٣) ئەسکەندەری مەقدونی کوڕی فلیب لە ساڵی (٣٣٦)پ. ز بۆتە پاشا و لەساڵی (٣٢٣)پ. ز مرد، ئەسکەندەر لە تەمەنی(٢٠) ساڵیدا لەپاش مردنی باوکی بووە بە پاشا، زیرەك و شارەزایی زانستەکانی سەردەمی خۆی بوو، ورەی بەرز و بە توانا بوو لە بەهاری ٣٣٤پ.ز دا بە لەشکری (٤٠) هەزار سەربازیەوە بە مەبەستی داگیرکردنی ئێران کەوتەڕێ.
لە هلسپووت (داردنیل)ەوە تێپەڕی بەرەو ئاسیای بچووك، لە کەناری خەلیجی ئەسکەندەرۆنە لەگەڵ سوپای ئێراندا کەوتە جەنگەوە و سەرکەوت، لەپاش ئەمە داریووشی سێیەم داوای ئاشتی کرد، بەڵام ئەسکەندەر بەوە رازی نەبوو، دوای ئەوە سوریا و میسری داگیر کرد، لە پاش ئەوە گەڕایەوە کەوکامیل نزیك هەولێر جەنگێکی سەختی لەگەڵ لەشکری داریوش کرد دووبارە سەرکەوت، دوای ئەوەی هەموو ئێرانی داگیر کرد و خۆی ناونا شاهنشای ئێران کچی داریۆشی مارە کرد، ئینجا بەرەو هیند رۆیشت تا (بەنجاب) لە

سـاڵی ٣٢٤ پ ز گەڕایـەوە ئێـران و دوای ئـەوە نـەخۆش کـەوت و لـە تەمـەنی ٣٢ سـاڵیدا لەکۆشکی (نەبوکەس نەسر) لەبابل مرد و تەرمەکەیان برد بۆ ئەسکەندەرییە.
ئەسکەندەر بووە هۆی بڵاوکردنەوەی شارستانیەت و زمانی یۆنانی لە ڕۆژهەڵاتدا، و پـتر لـە (٦٠) شاری لە ناوچە جیاجیاکاندان بەناوی ئەسکەندەر دروست کـرد. (فەرهـەنگی دیـوانی شاعیران (ناڵی–سالم–کوردی) د. محمەد نوری عارف، دەزگای ئاراس، ٢٠٠٩، ل٥١
خضري زيندە، کۆمەڵێ لە زانایان باوەڕییان وایە کە ئەو بەندە مەشهورە بە (خضر) و، بـە گوێرەی ئەوەی لە حەدیسەوە دەرئەکـەوێ، بـە تایبـەتی ئـەوەی کـە بوخـاری غـەیری ئـەو ریوایەتیان کردووە لە حەزرەتەوە(ﷺ) ئەو بەندە کاتێك دائەنیشت لەسـەر عـەرزی سـاف سپی گیای لێ ئەڕوا و سەوز ئەبوو، جا لەبەر ئەوە بوو ناونرا بە (خضر).
گەلێك لە زانایان لەسەر ئەوەن کە ئەو زاتە (نبی) بووە، واتە خاوەن شەریعەت بووە بـەڵام بۆ خۆی و فەرمانی گەیاندنی بە خەڵکی پێ نەدراوە، بە چەند بەڵگەیەك:
١–خودا دەفەرمووێ ﴿ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا﴾ و رەحمەت پایەی نبوەت)ە.
٢–خودا دەفەرمووێ ﴿وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا﴾ وە عیلمی لدنی کە بـە واسـیتەی مامۆسـتاوە نـەبێ هەر عیلمێکە کە بەوەحی خودایی بێ ئەویش بە (نبوەت)بێ.
٣–حەزرەتی موسا داوای لێ کرد ببێ بە تابیعی ئەو، وە هەرکەسێ کە پێغەمبەرێ تابیعـێ بـێ ئەبێ بە پێغەمبەر بێ.
٤–ئەگەر خضر پێغەمبەر نەبووایە بە موسای نەئەفەرموو ﴿وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَىٰ مَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ خُبْرًا﴾.
٥–لەکاتی بەیانی کردەوەکانی خۆی خضر فەمووی ﴿وَمَا فَعَلْتُهُۥ عَنْ أَمْرِى﴾ واتە بـە ئـەمری خـودا ئەمانەم کردووە.
٦–ریوایەت کراوە کاتێ موسا پێی گەیشت و فەرمووی (السلام علیك) وەڵامی داوە و فـەرمووی (وعلیك السلام یا نبی بنی اسرائیل) جـا موسـا فـەرمووی چـۆن ئـەزانی مـن پێغەمبـەری بـەنی ئیسرائیلم؟ ئەویش فەرمووی ئەو کەسی تۆی ناردووە بۆ لای من پێی وتووم کە تۆ پێغەمبـەری بەنی ئیسرائیلی.
وە زۆریش لە زاناکان فەرموویانە ئەو بەندە کە مەشـهورە بـە خضـر (نـبی) نـەبووە بـەڵکو وەلی و دۆستی خودا و پیاوێکی خاوەن پایە و مایەی ڕۆحی بووە، چـونکە ئایـەتی قورئـان نەصە لەوەدا کە ئەو زاتە خاوەن رەحمەت بووە لەلای خوداوە لە عیلمی (لـدنی)دا بەشـدار بووە ئەمە بە قەتعی مەعلومە.
بەڵام پلەی پێغەمبەریتی بەڵگەیەکی بـەهێزی لەسـەر نییـە و ئەصـل (عـدم نبـوە)وە ئـەو بەڵگانەش کە گێڕاونەتەوە لەسەر پێغەمبەریتی خضر ئەو نەتیجە نادەن، چونکە رەحمـەت

مـن بـە میزانـی طبیعت گەوهـەر ئەفرۆشـم دڵـم
وا لەشـامی زوڵفـی تـۆدا کسـبی عگـاری ئـەکار[1].

گەلێ مەعنای هەیە وەکو (نبوە)و (ولایە)و (علم)و (کەرامەت)و حورمـەت و غـەیر ئەمانـە لـە صیفاتی بە نرخ و قیمەت.
﴿وَمَا فَعَلْتُهُۥ عَنْ أَمْرِى﴾ موجیب نییە بۆ (نبـوە) بـەڵکو مـەعنای ئیلهام لەوێدا بـەهێزترە، وە فەرموودەی (وکیف تصبر) دەلیل نییە لەسەر نبوەت، چونکە گەلێ لە ئەولیای خاوەن پایە بە جۆرێ مەستی نوور و رەحمەتی خودان تەواناییان نییە بە دەقیقە لە یادی خودا دەرچن، وە لە خودا بەولاوە کەسیان لەبیر نیە و بێجگە لەخودا گوێ بە هیچ کەس نادەن، وە زیادە لەمانە لازم ناکا هەرکەسێ (نبی) بێ هەموو شت بزانێ، لەوانەیـە یـەکێ لەئـەولیا (مخـتص) بێ بە گەلێ زانیاری و گەلێ کاروباری کە ئەوانە هەر لای ئەوین و بەس کەواتە حەق وایـە لـە (ولایە) بەولاوە پایەکی تر بۆ خضر دانەنرێ بەوەی بناسرێت.
باسی ئەوەی خضر ئێستە ماوە یا مـردووە؟ وە تـا کۆتـایی دنیـا نـامرێ بۆیـە پـێی ئـەڵێن: خضري زیندە...ئەوە وەکو بازێ لە زاناکان فەرموویانە زۆر ئەبێ بەهۆی سەرسـام بـوون و دامانی ئینسان، چونکی ئیعتباری ویلایەت بۆ کەسێ و دەوامی ژیانی لە دونیـادا یـا نـەمانی نە لە ئەصلی دینە و نە لە فەرعی دین و نە لە ئیسپاتیا سوودی هەیە نـە لـە بوونیـا زیانـێ ئەگا بە قەواعیدی دین.
کەوایـە داخسـتنی دەرگـای ئـەم باسانە گـەلێ باشـترە لـە کردنـەوەیان بـە تایبـەتی لـەناو عەوامدا، تەفسیر نامی، عبدالکریم مدرس، بەرگی پێنجەم، ل٥١، دار الحریە. واتـە دڵـی مـن من وەکو ئەسکندەر کە هەموو شوێنی داگیر کرد، ئێستا کەوتۆتە نـاو تاریکـایی زوڵفـت کـە ڕەشە، کێ هەیە رزگاری بکات! وە ئەگەر کەسـێکی وەکـو خـدری زینـدە بێـت بـە ماچـێك رزگاری بکات.

(١) میزان: تەرازو ناوی بورجی حەوتەمە، گەوهەر شتی گرانبـەها، شـامی سـەرەتای شـەو یـان ئێوارە، چواندنی زولـف کـە رەشـە بـە سـەرەتای شـەو چـواندووە، واتـە مـن بـە سروشـتی تەرازوو شتی گرانبەها دەفرۆشم دڵم، چونکە مـن لـەناو زوڵفـی رەشـی تـۆدا خـەریکی کـارو کەسابەتم.
دەبێت مەبەستی ئەوە بێت هـەر کاتێك شـەو داهـات و دنیـا تاریـك بـوو ئـەو کاتـە دەچـمە خەڵوەت و خەریکی خوا پەرستی دەبم.

**مەیخەرە ژێر پێتەوە، گەر حەز ئەکەی ژیربیێتەوە**
**دڵ کە منداڵە شکر خەندەی لەبت چاری ئەکا[١].**
**مرغی دڵ بـرژا لەبەر قرچەی هەتاوی فرقنت**
**تاوەکو کەی داوی زولفیشت گرفتاری ئەکا[٢].**
**طوطي دوکانی حوسنت بلبلی طبعي منی**
**خستە نیو بەندی طماع و فێری بازاری ئەکا[٣].**
**مەستی بادە و چاوی ئەوم و پێم ئەلی مەستی مەیە**
**سەیری کەن بوختانی ناحەق چۆن بەلەب جاری ئەکا[٤].**
**بیرە مەیدانی فصاحت ئەسپی خۆت لنگدە (حەریق)**
**تا بزانم کێ بە شیعرت صحبت بازی ئەکا؟[٥]**

---

(١) لب: لێو واتە دڵم وەکو منداڵێك وایە هەردەم بە دواتەوە دەگریێ تۆش گەر دەتەوێت ئەو دڵەم ژیر ببێتەوە هیچی دیکە نەگریێ، مەیخەرە ژێر پێتەوە و فەرامۆشی مەکە، دڵی من بە خەندەی لێوت ژیر دەبێتەوە لە نێوان (ژیر بێتەوە)و (ژێر پێتەوە) جیناس هەیە.
(٢) دڵ وەکو باڵندەیەك وایە ئێستا لێت جیابۆتەوە خەریکە لەبەر قرچەی گەرما دەبرژێ لەبەر گەرمی، تۆش هەتاکەی بە زوڵفەکانت داو بۆ ئەو دڵەی باڵندەی من دادەنێیەوە.
(٣) واتە من لەبەر دەرگای جوانی تۆدا شیعری جوان و دڵرفێن دەڵێم، یاخود دەبێتە هۆی ئەوەی هۆنراوەی جوان بڵێم، یاخود دەبێتە سەرچاوەی ئیلهامی من لە هۆنراوە گوتن، بەوەش منی خستە نێو بەندی تەماع و فێری کڕینو فرۆشتنی کرد، کەواتە تۆ دوکاندار شتی جوان دەفرۆشی، منیش کڕیار بە هۆنراوەی جوان دڵرفێن.
(٤)مەستی: خۆشەویستی، مەی: شەراب، ئارەق، بوختان: قسەی ناهەق واتە من عەشق و خۆشەویستی چاوی ئەوم کەچی ئەو پێم دەڵێت مەستی ئارەقی، وەرن سەیر بکەن چۆن بە لێوەکانی ئەو بوختانەم پێ دەکات.
(٥)فەساحەت: زمان پاراو، صحبت: گفتوگۆ، بازی: ئینجا، واتە حەریق وەرە مەیدانی زمان پاراوی ئەو ئەوەی لە تواناتدا هەیە بیکە یاخود زمان پاراویت بخەگەر، ئینجا بزانم کێ هەیە بتوانێت شان لە شانی هۆنراوەت بدات و وەکو تۆ هۆنراوەی بڵێت.

هــەروی خەفەتــە بــەفری غــەمی داوە بــە ســەرما
یــا سەرســەری دوریتــە کــە لێــی کردوومــە ســەرما[1].
گاهی بە شەرارەی غـەم و گـەهـ سەرسـەری هیجـران
خۆشی نەبوو، بۆمن نـە بەگـەرما و نـە بـە سـەرما[2].
کەوتۆتــە ســـەرم ئەشـــك و غوبـــاری ئــەلمی دڵ
یعــنی کــە قــوری محنتــە کردوومــە بــە ســەرما[3].
گـــەر ئەچـــمەوە (صـــاحب) نیـــە مونســـی جـــان
گــەر دێمــە ســەقز نــاری ســەقەر وا لــە جگــەرما[4].

---

(١) سەرســەر: صرصــر: بــای ســارد خــوا دەفــەرمووێت: ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا صَرۡصَرٗا فِي يَوۡمِ نَحۡسٖ مُّسۡتَمِرّٖ﴾(القمر:١٩) واتــە: ئێمـە بایـەکی بـەردەوامی تونـد و سـەخت و ساردمان هـەڵکردە سەریان لە رۆژگارێکی شومدا یەك هەفتەی خایاند. هـەروەها ﴿وَأَمَّا عَادٞ فَأُهۡلِكُواْ بِرِيحٖ صَرۡصَرٍ عَاتِيَةٖ﴾ واتە گەلی عاد بە رەشەبایەکی ساردی بەهێزی وێرانکەر لەناوبران.
واتە هەوری خەفەت وەکو بەفر بـە سـەرم دا دەبارێت و سـەری سـپی کـردووم یـاخود ئـەو خەفەتە هی دووریتە وەکو بای سارد و بـەهێز لێـی کردوومـە بـە سـەرما لـەنێوان سـەرمای یەکەم و دووەم جیناس تەواو هەیە.
(٢) گاهی: جارێ، شەرارە: پریشك، هەندێك جار غەمی دووری تۆ وەکو پریشکی ئاگر بۆم دێت کە گەرمە، هەندێك جاریش وەکو بای سـارد دێـت کـە هـەردووکیان زۆر خێـران، بـەڵام هـیچ کامێکییان سوودی بۆ من نیە نە لە گەرما و نە لە سەرمادا.
(٣) ئەشك: فرمێسك، ئەلەم: ئێش و ئازار، محنت: دەرد و بەڵا،واتە بەهۆی دووریتـەوە ئـێش و ئازار و دڵ هێندە زۆرە کەوتۆتە سەرم کە هەردەم فرمێسك و تـەم لـە سـەرمە هـەر دەڵێـی قوری دەرد و بەڵایە بە سەرما هاتووە غوبار تەپ و تـۆز لەگـەڵ فرمێسك تێکـەڵاو بـووە و قوڕی لێ پێك هاتووە.
(٤) صـاحب: گوندێکـە لـە رۆژهـەڵاتی شـاری سـەقز، مـونس ئیسـمی فاعیلـە واتـە هـاودەم و هاونشین و دڵدەرەوە، جان: گیان، روح، ناری سەقر: ئاگری دۆزەخ ﴿سَأُصۡلِيهِ سَقَرَ ٢٦ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا سَقَرُ﴾(المدثر:٢٧) واتە: ئەو بێ ویژدانە بە سەریەوە ناچێت دەبێت بیەگەینمـە دۆزەخ، جـا تۆ نازانیت دۆزەخ چییە؟
واتە ئەگەر دەچمە گوندی (صاحب) ئەوا هیچ هاونشین و هاودەمم نیـە دڵنـەوایم بکـات، وە

شـاهمە حواسـم كـە سـەكەم چـەندە كەساسـم

بـە خـوا نیـە غـیرەت لـەخیال و لـە نظرمـا[1]

هـەر چـەندە بـە جسـمانی كـە دوورم لـە حضـورت

رووحانیـە ثابتـة لـە نێـو زبـدەی سـەرما[2]

طوفـانـی سروشـكم چـووە سـەر جـوودی وجـودم

كەشتی تـەنی نقـوم كـرد و نـە نـوح و نـە ئـەثرمـا[3]

---

ئەگەر دەچە شاری سەقز ئەوا خراپتر چونكە ئاگری دۆزەخ هەموو وا لە جەرگمدایە. لە دەرونزانیدا بەریەرەكانی بەدواوە چوون (صراح الأحجام الأحجام) واتە: هەر كاتێك مرۆڤ بەرەو رووی دووكاری چون یەكە دەبێتەوە و نازانێت كامیان هەڵبژێرێ، كارەكانیش ناخۆشن. پێشینانان گوتویانە (دارێكم لە دەستە سەرێكی ئاگرە و سەرەكەی تری پیساییە).

(١) حواسم: هەستەكانم كۆی حاسەیە، نظرما: لە روانینما واتە هەموو هەستەكانم شاهیدن لەسەر ئەوەی من كەساسم، بە بەڵگەی ئەوەی نە چاوم دەبینێ و نە گوێم دەبینێ و نەزمان دێتە قسەكردن ئەی هەموو كەسم، ئەوە وای كردووە نە غیرەتم بمینێ لە خەیاڵ و لە روانین و تەماشاكردنتا.

(٢) جسم: لەش، پابت: جێگیر، واتە هەرچەندە بە لەش لێت دوورم، بەڵام بە بیروهۆش و روحانیەت تۆ هەردەم لە نێو بیر و مێشك و خەیاڵمدای و لەبەرچاومی، بۆ ساتێكیش لێم جیا نابیتەوە.

(٣) طوفان: لافاو، سروشك: فرمێسك، أثر: شوێنەوار.

واتە هێندەم فرمێسك رژاند هەتا لافاوی لێ دروست بوو هەروەكو لافاوەكەی حەزرەتی نوح كە كێوی جودی گرتەوە و گەشتیەكەی لەوێ لەنگەری گرت ﴿وَقِيلَ يَٰٓأَرۡضُ ٱبۡلَعِي مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقۡلِعِي وَغِيضَ ٱلۡمَآءُ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّۖ وَقِيلَ بُعۡدٗا لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ (هود:٤٤) واتە: فەرمان بە زەوی كرا ئاوەكەت با رووبچێت بە ناخیدا، ئەی ئاسمان تۆش با بەس بێت و باران مەبارێنە ئیتر ئاوەكە رووچوو فەرمانیش بە رێكی و تەواوی ئەنجامدرا، كەشتیەكەش لەسەر كێوی جودی لەنگەری گرت و وترا نەك دووری لە بەزەیی خوا و تیاچوون بۆ بەرەی ستەمكاران.

جا كە شتیّ لەنێو فرمێسكی من نقوم بوو نە نوح و نە شوێنەواری بە جێما.

**لەوساوە کە تۆ رویی، دڵم رویی بە دوتا**
**هێلانەی تەن هەروەکو مەأوای سقر ما[1]**
**بێ فەوجی وەفاکەت کە جەفایە وەرە ئەم شەو**
**ئەم لەشکری ئاهی منە بێ فتح و ظفر ما[2]**
**لەم قەسوەتەدا، تاوەکو کەی پەردەی ظلمت**
**بەرچاوی دڵم بگری، دەسا بێ بە گوزەرما[3]**
**ئاوێنەی دڵ ژەنگی قەساوەت روخی پۆشی**
**خاکستری دڵ سوختەیی بێنە بە سەرما[4]**

---

(١) لەوکاتە کە تۆ رۆیشتی و بەجێت هێشتم بە لەش، بەڵام دڵم بە دواتا هات لێت جیا نەبۆوە، لەشی من وەکو هێلانە وابوو کە شتی زیندووی تێدا نەبێت ئەو هێلانەیەش بۆتە ئاگری دۆزەخ بۆ من.

(٢) جەفا: شتی بێ نرخ و بێ کەڵك، ئاه: هەناسەیە لە دڵ و دەروونی خەفەتاوی دێتە دەرەوە، فەتح: رزگار کردن، ظلمت: تاریکی.

واتا سوپای وەفاکەت هەوڵێکی زۆریدا، بەڵام بێ هودە و بێ نرخ بوو، جا وەرە ئەم شەو بەرامبەر لەشکری ئاه و خەفەتی من چۆن دەتوانیت زەفەری پێ ببات و رزگاری بکات.

(٣) گوزەر: پێدا رەت بوو: ظلمت: تاریکی، قەسوەت: سەخت و ناخۆش، ئەو دێرە پەیوەندی بە دێری پێش خۆیەوە هەیە واتە هەتاکەی وەفات نابێت و بە هێز و دەسەڵاتەی هەتە پەردەی تاریکی لە نێوان من و خۆتدا داداوەتەوە بەرچاوی دڵمت گرتووە، دەسا بە وەفای خۆت لای ببە بەڵکو ببێ بە گوزەرما.

(٤) روخ: روومەت، خاکستر: خۆڵەمێش. واتە دڵ وەکو ئاوێنە راستگۆیە، بەڵام بەهۆی دڵڕەقییەوە ژەنگی گرتووە سەرتاپای رووی داپۆشیوە و وێنەکان وەکو خۆی پیشان نادات، جا کەوایە ئەو خۆڵەمێشە دڵ کە ورد بووە بە سەرما دا بکە.

مـــەنواره بـــه ظـاهر كـــه بـــەبێ قـــووتم و رووتم
رووتـــی و قـــووتی خـــەیاڵت غـــەزەلی چـاكه لەبـــەرما[1]
ســــــەرمایەی ئـــــەم ملكــــی خیالاتــــــه (حـــــەریقی)
حەیفی كه تەلەف بـوو بـه هـەدەر چـوو بـه ضررما[2]

---

(١) واته به چاوی سەر و به ئاشكرا تەماشام مەكە كەمن كەسێكی هەژار و بێ خۆراك و برسیم و بێ جلوبەرگم، ئەو رووت وقوتیەكە تۆ تەماشای دەكەی ئەوە نییە بەڵكو رووت قوتی ئەوەیە كە خەیاڵت هەردەم وەكو ئەو غەزەلانەوایە كە من لەبەرمایە.

(٢) تەلەف: بۆگەن ، ضرر: زیان، هەدەر: بەفیڕۆ لەناو چوو واتە: هەم ئەو دەست مایە كە موڵك خاوەنی خەیالاتە حەریقی، جێگای داخە كە هەموو بۆگەن و بێ كەڵك بوو بەمەش بە خۆڕایی دەڕوا و بەمەش بە زیانی من كۆتایی دێت.

# پیتی تاء

قوربـــان وەرە قوربانـــە ســـا بمکـــە بـــە قوربانـــت
رەنگـــین کـــە بـــە خوێنـــاوم کـــاکۆلی پەرێشـــانت[1]
ئازادییـــە ئـــەم ڕۆژە ســـا فـــەرموو بـــە ئازانـــە
تـــیرت لـــە کەمانتخـــە بـــۆ قـــەتلی شـــەهیدانت[2]
جەژنانـــەی مـــن روحـــە کردوومـــە بـــە قوربانـــت
تـــۆش ماچـــی کـــەرەم فـــەرموو لـــەو ســـێوی زنخـــدانت[3]
طفلـــی دڵـــی بێچـــارە مدەیەکـــــە گرفتـــارە
غـــەمخواری دڵ ئـــازارە نـــاوکی موژگانـــت[4]

---

(١) قوربان: وشەیەکە بۆ ڕێزلێنان، قوربان، کاتی قوربانی و خوێن ڕشتنە، کاکۆلی پەرێشان: قژی پەرش و بڵاو، زولفی ئاڵۆز و شێواو، واتە قوربان ئێستا کاتی قوربانی کردنە کە دەکاتە (١٠، ١١، ١٢، ١٣) مانگی (ذوالحجة) خەڵکی قوربانی دەکات بۆ زیندووکردنەوەی یادی حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسماعیلی کوڕی (سەلامی خوای لێ بێت) وەرە تۆش من بکە بە قوربانی خۆت، ئینجا بەو خوێنەی لە من دەڕژێت قژ و زولفی ئاڵۆز و شێواوت ڕەنگینە، لە جیاتی ئەوەی لە خەنەی بگری.

(٢) کەمان: پارچە چەرمێکە وەکو کیسە وایە تیری تێ دەکرێت واتە ئەم ڕۆژە ڕۆژی ئازادییە تۆش وەرە زۆر بە ئازانە تیرت لە کەمانت خە وەرە جەنگەوە بۆ ئەوەی بەو تیرانە بەرامبەرەکەت شەهید بکەی.

(٣) زەنەخدان: چەناگە، واتە ئەو دێرە پەیوەندی بە دێرەکانی پێش خۆییەوە هەیە، کە کاتی قوربانی ڕۆژەکانی جەژنی قوربانە، خەڵکی لەو ڕۆژانە جەژنانە دەدەنە یەکتری، من لەو ڕۆژە کە جەژنە گیانی خۆم کردووە بە جەژنانە، دەی تۆش وەرە ماچێك لەو گەردەنەت کە وەك سێو خڕ و سوورە بکە بە جەژنانە بۆ من.

(٤) طفل: منداڵ، مدەیەکە: ماوەیەکە، موژگانت: پـرژانگ. واتە دڵ وەکو منداڵ وایە بۆ ماوەیەکە بێچارە و گرفتارە، هەردەم خەم دەخوات ئازار دەکێشێ بەهۆی برژانگەکانتەوە کە وەکو تیر وایە دەیهاوێژێ لە دڵم ڕادەچێت برینداری دەکات.

روح و دڵ و دین هەرسێ مجموع بە یەک دەفعە
قوربانی ساعاتێکی لەعلی لەبی مەرجانت[1]
مقصودی من إضهارە بۆ ئەمثلە ی مەدحت
بۆ تحفەی ئەوصاف و ئەزهاری گوڵستانت[2]
ئەی خسرەوی پەروێزم شیرین شەکر رێزم
فەرهاد دڵی کوشتم چاوی رەشی فەتانت[3]
ممکن نیە تقسیم ضرب عەدەدی زەخمت
منها کە لە تقسیمە ضرب خەمی چوگانت[4]

---

(١) بەیەك دەفعە: بەیەك جار، مەقصود: مەبەست، لەعل: بەردێکی سوری بەنرخە، لەب: لێو، مەرجان: بەردێکی سوری بەنرخە. واتە روح و دڵ دین هەرسێ بە جارێك بە قوربانی ساتێکی لێوەکانت بێت ئەو لێوە وەك ئەو بەردە بەنرخە سورە وایە لە نێوان لێوەکانت وەکو دانەی مەرجان وایە.

(٢) مقصودی: مەبەست، إظهار: دەرخستن، مدح: پیاهەڵگوتن بە چاکە، تحفە: شتی بە نرخ و بەنرخ و دەگمەن، ئەزهار: کۆی زەهرەیە گوڵ، گوڵستانت: باخی پڕ لە گوڵ.
واتە مەبەستی من لە بەدیار خستنی جوانترین پیاهەڵدانی تۆ وەکو ئەو شتە گران و بەنرخانە وایە کە گوڵێك بێت لە نێو گوڵزاردا.

(٣) خسرەوی پەروێز: ئەوەی نەوشیروانی دادپەروەر بووە، لە سەردەمی ئەودا پێغەمبەر (ص) لەنیمچەدورگەی عەرەب پەیدا بووە، پاشایەکی خاوەن شکۆ بووە، دەوڵەمەندی گەنجینەکانی بوون بە ئەفسانە، دڵداری لەگەڵ شیرین بووە بە سەرچاوەی چیرۆکی شیعری لە ئەدەبیاتدا. (دیوانی نالی، د. مارف خەزنەدار).
واتە: تۆ وەکو خسرەوی پەروێز دادپەروەر و خاوەن گەنجینەی زۆر، هەروەکو شیرینیش گفتوگۆت خۆشە و وەکو شەکر وایە، بەوچاوە رەشت دڵت کوشتم.

(٤) ممکن نییە: نابێت، تقسیم: دابەش، ضرب: لێکدان، زەخم: برین، چوگان: چەماوە، چەوگان گۆچان دارێ کە دەسکەکەی راست و باریکە و سەرەکەی کەمێ چەماوەیە لە یاری (چەوگان بازی) دا دەکێشرێت بە تۆپدا، (لە هەندێك شوێن قاشوانێی پێ دەڵێن، هەروەها

دڵ طـــالبي روخســـــارت جـــــان طـــالبي گوفتــــارت
فرزنـــدەی خـــیرەد رۆیـــی بـــۆ لـــەعلی بەدەخشـــاند[١]

بێســـتانە کـــەناری دڵ بـــۆ نـــەخلی قـــەدت قوربـــان
دیـــدەم وەکـــو روبـــارە بـــۆ ســـەروی خـــەرامانت[٢]

قەلعـــەی دڵەکـــەم قوربـــان نیشـــانەیە بـــۆ تـــیرت
ســـینەم وەکـــو ســـەحرایە بـــۆ جلێـــوەی مەیـــدانت[٣]

بـــۆ چـــاوی کـــەوا مەســـتە، دڵ ســـتە ســـەرم مەســـتە
ئـــەم ئەبرۆیـــە پێویســـتە بـــۆ قـــەتلی مرحینانـــت[٤]

---

ئەو دار سەرچەماوەی کە دەهۆڵی پێ لێدەدرێت، فەرهەنگی دیوانی شاعیران (نالی و سالم و کوردی)، د. محمد نوری مارف.

واتە: ناکرێت ژمارەی برینەکانت لێك بدرێت بە دابەش و لێکدان چونکە بەوانە خەم وات لێ دەکات بەژن و باڵات وەکو گۆچان بچەمێتەوە.

(١) جان: گیان، خێرە د: هۆش، لەعل: لێو، بەدەخشان: ناوی ناوچەیەکە لە تورکستانی ئەفغانستان کە بە لەعل بەناوبانگە، هەروەها بە مانای لەعلیش هاتووە (دیوانی نالی و فەرهەنگی ناڵی) د. مارفە خەزنەدار.

واتە: دڵ هەردەم تامەزرۆی روخسارتە و حەز دەکات تێر بۆت بڕوانێ و لێ تێر نابێت هەروەها گیانیش عەشقی قسە خۆشەکانتە، ئەوانەش وایان کردووە هۆش و بیرم بڕوات بۆ وڵاتی بەدخشان کە پڕ لە لەعل ئەو لەعلانەی لە لێوەکانی تۆ دەچێت.

(٢) بستان: باخچە، نار: ئاگر، نەخل: دارخورما، دیدە: چاو، سەرو: دەرختێکی بەرزە، خەرمان: بە روبوومی دانەوێڵە.

(٣) قەلعە: قەڵات، سەحرا: بیابان، جلیوە: خۆپیشاندان، مەیدان: گۆرەپان. واتە: قەڵاتی دڵم بۆتە جێگای نیشانەی تیرەکانی تۆ، سینەشم وەکو بیابان وایە بۆ پیشاندانی جوانی خۆت هەروەکو چۆن خەڵك بۆ خۆبەدیار خستن یاری کردن دێنە گۆرەپان.

(٤) مەست: سەرخۆش لە ئەنجامی خواردنەوەی مەی هۆشی نەمێنێ.

واتە: بۆ ئەو چاوانەی کە خەڵك سەرخۆش دەبێت، دڵیش لە ئاستیدا زۆر سست دەبێت هەرکاتێك تەماشای چاوەکانی دەکەی بەچاوی سەر، سەرخۆش دەبێت ئاگای لە خۆی نابێت، ئەبرۆکانیش کە وەکو تیر وایە پێویستە بۆ کوشتنی خۆشەویستەکانت.

تەنها کە (حریق)ی من بر شمع شبستانت
مەمکوژەرەوە توخوا سات و بە رفیقانت[1]

ئەم خوسرەوەی خوبانە کەوا دەیْتە نظارەت
شیرینە ئەگەر دڵ برفێنێ بە ئیشارەت[2]

ئیسمێکی شەریفی هەیە منع لە تەصرف
جسمێکی لەتیفی هەیە لایق بە صەدارت[3]

نقدی دڵ و روحم هەیە بۆ موژدە لە رێدا
زۆر لایق و شایستە بیدەم بە ئیشارەت[4]

---

(١) شمع: مۆم، مەبەست رووی گەش و جوانە، سبستان: تاریکای بەمانای شوێنی نوستنی ژنانی پاشاش دێت کە لە کاتی نوستن چرا دەکوژێتەوە و تارێك دەبێت. واتە: تەنها رووی گەشی تۆ کە وەکو مۆم وایە بۆ من شەوە تاریکەکان رۆناك دەکەیتەوە بە رووی گەشت، جا تکایە سوێند بە رەفیقەکانت دەست هەڵگرە لەم کوشتنە.

(٢) خسرەوی خوبان: دلبەری شۆخ و شەنگ، نڤارەت: تەماشاکردن.
واتە: ئەو دڵبەرە شۆخ و شەنگە هەر کاتێك بەدیار دەکەوتێت تەماشای دەکەی هێندە شیرین و جوانە بە تەنها ئاماژەیەك دڵی مرۆڤ دەفرێنێ.

(٣) ئیسم: ناو، منع: قەدەغەکردنی کەسێك لە کارێك، تصرف: هەڵسوکەوت، جسم: لەش، لەتیف: نەرم و شل و ناسك، لایق: شایان، صدارەت: پێگەی بەرز.
واتە: ئەو دولبەرە شۆخ و شەنگە ناوێکی هێندە بەرێز و خۆشی هەیە، هەموو مرۆڤێك لە هەڵسوکەوت کردن رادەگرێت، لەش و لارێکی هێندە نەرم وشل و ناسکی هەیە هەر شایانی ئەوەیە لە شوێنی بەرز دانیشێت.

(٤) واتە رەخنە لەوە هەیە کە دڵ و روحم بۆ نەبووە قوربانی لە خۆشی ئەو موژدەیەدا کە زۆر قابیل و شایستەی ئەوەیە دڵ و روحم بیدەم بە تەنها ئیشارەتێك.

حەیفە سەگی قاپیت لە زیانا بی زەمانی
بێ باکم ئەگەرنا هەزار جورم و جینایەت[١]

میوەی ئەمەلم کاڵە بە دوو چاوی کالی
کالای خەیالم هەموو رۆیوە بە غارەت[٢]

لەو وەختەوە تخفیف کرا ئیسمی شەریفت
مـن سووکی لەلام بۆتە نهایات و وەزارەت[٣]

نقطەی دهنت وا دڵی هێناومە تەنگی
جێگای خەیاڵی نیە بۆ فکری بەکارت[٤]

---

(١) واتە: جێگای داخە من سەگی بەردەگاتم و لە زیانا بم بۆ ماوەیەك ئەگینا من باکم نییە ئەگەرنا هەزار تاوان و گوناه دەکەم.

(٢) ئەمەل: هیوا، کاڵ: نەگەیو، غارەت: بە تالان.

واتە میوەی هیوا و ئاواتم هێشتا نەگەییوە بە هەردوو چاوە کاڵەکەانی، هەرچی کەلوپەلیش هەیە لە خەیاڵمدا هەموو بە تالان چووە و هیچی نەماوە و فەوتاوە.

لە دیوانی حەریق، مەحمود خاکی کاڵە نووسراوە تاڵە بەڵام ئێمە (کاڵ)مان بەلاوە پەسند وبوو چونکە میوە دەبێت کاڵ بێت پێ نەگەیشتبێ، جگە لەوەش میوەی کاڵ لەگەڵ چاوی کاڵ جیناسی تەواو دروست دەبێت.

(٣) تخفیف: سوك، نیهایەت: کۆتایی.

واتە: لەو کاتەوە ناوی بەرێز و گەورەی تۆ سوك کراوە بە سوکی ناوت دەبەن، ئا لەو رۆژە سوکی لەلام بۆتە پلەی کۆتایی وەزارەت.

(٤) نقطە دەهن: مەبەست دەم و لێوی جوان

واتە: ئەو قسە جوان و رێك و پێکانەی دەربارەی جوانی دەم و لێوت دەکرێت دڵی منی هێناوەتە تەنگی واتە دڵی تەنگ کردووم، لە بیر و هۆشی تۆشدا جێگای خەیاڵی تێدا نەهێشتۆتەوە.

تـــــۆ صـــــاحب چـــــاه زنخــــــدانی قوربـــــان
ســـــەد یوســـــف کنعـــــانی دەبیەیتـــــە زیـــــارەت[1]

بـــاکم نییـــە لـــەو خەنجـــەرەی دەیکـــەی بـــە کەمـــەردا
شمشـــێری بـــرۆت جـــەرگی بڕیـــوم بـــە ئیشـــارەت[2]

شـــیطانـــی رەقیـــب دوژمنـــە بۆیـــە کـــە رەحمـــان
رەحمـــی نیـــە بـــۆ حـــالی دڵ پـــڕ لـــە حـــەرارەت[3]

---

(١) چاه: بیری ئاو، زەنخدان: چاناگە، چاه زنخدان: ئەو چاڵەی لەسەر چەناگەی مرۆڤدا هەیە، یوسف: حەزرەتی یوسفی کوڕی یەعقوب، لای باوکی خۆشەویست بوو، براکانی ئیرەییان پێ دەبرد، بە فێڵی سەیران بردیانە دەشتی کەنعان فڕێیان دایە ناو بیر و پاشان کاروانچی هاتن لە بیرەکە دەریانهێنا و لەگەڵ خۆیان بردیانە میسرو فرۆشتییان ﴿ وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍ بَخْسٍ دَرَاهِمَ مَعْدُودَةٍ وَكَانُوا فِيهِ مِنَ الزَّاهِدِينَ ﴾
واتە: تۆ خاوەنی ئەو چاڵەی کە لە چەناگەتدا هەیە قوربان سەدکەسی وەکو حەزرەتی یوسف دێتە زیارەتت.
شاعیر ئەو دێرە هۆنراوەی وەرگرتووە (ئیقتیباس) لە ئایەتی قورئانی پیرۆز، ئەوەش بەڵگەیە کە حەریقی رۆشنبیرییەکی ئاینی هەبووە ﴿ قَالَ قَائِلٌ مِّنْهُمْ لَا تَقْتُلُوا يُوسُفَ وَأَلْقُوهُ فِي غَيَابَتِ الْجُبِّ يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ السَّيَّارَةِ إِن كُنتُمْ فَاعِلِينَ ﴾ (یوسف: ١٠)
(٢) بە کەمەردا: بە بشتدێنتا: بە ناوقەدتدا.
واتە: من باکم لەو خەنجەرە نیە کە دەیکەی بە ناوقەدتدا لێی ناترسم و بە خەیاڵمدا نایەت، بەڵکو ئەوەی من لێی دەترسم برۆکانتە کە جەرگی بڕیوم بە ئیشارەت.
(٣) رەقیب: ئەوەی چاودێری خەڵك دەکات، رەحمان: سیفاتی خوایە بۆ خوا بەکار دێت، حەرارەت: گەرمی.
واتە: شەیتان وەکو دوژمن وایە هەردەم خۆی مەلاس داوە بۆ ئەوەی بزانێت لە هەڵسوکەوتم، هەربۆیە خوداوەندی رەحمان رەحمی نییە بۆ ئەو کەسانەی کە هەردەم دڵییان پڕ لە حەرارەتە واتە کەف و کوڵی خۆشەویستیان لە دڵدایە.

ئـــەی دڵ وەرە شـــادی کـــە لـــەبۆ بـــەزمی وصـــالت
وا دیومەتـــــــەوە دلبەرەکـــــەی تـــــازە نهالـــــت[١]

مدەییکــــە ئـــــەی بلبلـــــی گۆشــــەی قفســــی غـــــەم
فصـــلت بـــووە لـــەم گـــول بەدەمـــەی نـــەوخط و خالـــت[٢]

خـــــامۆش و نمـــــد پـــــوش و مجـــــرد لـــــە علایـــــق
نەمبیســـــــتووە ئـــــاوازی دەمـــــی طفلـــی منالـــــت[٣]

ســـا هەڵســـە لـــە شـــوکرانەی ئـــەم موژدەیـــە ئـــەی دڵ
ئامادەکـــــە ئەســـــباب طـــرب و صـــــفت حالـــــت[٤]

---

(١) وصال: بەیەکگەیشتن، نهال: درەختی تازە رواو.

واتە: دڵ وەرە شادی بخەرە نێوانمان بە هۆی بەیەك گەیشتنی منو دڵبەرەکەم، چونکە ئێستا ئەو دڵبەرەی خۆم دەبینم، چ دڵبەرێك! ئەو دڵبەرەی کە تازە پێدەگات هەروەکو ئەو درەختەی کە تازە دەڕۆی ناسك و جوانە.

(٢) مدەیەکە: ماوەیەکە، فصل: جودابونەوە، خط و خاڵت: ئەو مووە تازانەی کە لە رووی گەنج دێت، یاخود کینایەیە بۆ برۆ و برژانگ.

واتە: ماوەیەك بولبول لە قەفەس بەندکراوە، و جودا بۆتەوە لە گوڵ و ناتوانێت بچێتە سەر گوڵ بنیشێت و بخوێنێ، منیش دەمێکە بولبول ئاسا غەم دایگرتووم دوورم لە بینینی برۆ و برژانگت.

(٣) خامۆش: بێ دەنگ، نمد: لباد لە خوری دروست دەکرێت وەکو رایەخ خەڵك لەسەری دادەنیشێت، علایق: پەیوەندی.

واتە: ئەو کەسەی کە لە نێو لباد دەنوێ پەیوەندی خۆی دەپچڕێنێ و بێ دەنگی هەڵدەبژێرێ وەکو ئەو منداڵە کە گوفتاری نابیسرێت کەس لەئاوازی ناگات.

(٤) واتە: ئەی دڵ هەستە بۆ شوکرانەی ئەو موژدەیە کە پێت بەخشرا، ئامادەکە هەموو پێویست و هۆکارەکانی بەزم و رەزمی خۆش و ئاهەنگ ئامادە بکە بۆ ئەو خۆشیەی بەسەر روتا هاتووە.

فرشــــی غــــەزلت راخـــــە لـــــەنێو حـــــوجرەی دڵـــــدا
فخـــــــر العلمــــــا بنێــــــرە دیــــــوانی خــــــەیاڵت[1]

بـــــۆ پێشکەشـــــی ری عــــەد بکـــــە ئەوصــــاف جمیلـــــی
خـــــەرج کـــــە لـــــەریی دعـــــوەت ئـــــەودا ســـــەروماڵت[2]

حـــــەدم چـــــییە عـــــەد بکـــــەم ئەوصـــــافی جمیلـــــی
مـــــردوت مـــــری کرمـــــانجی لـــــەبۆ عـــــەقل و کـــــەمالت[3]

ژاتێکـــــە موبررایـــــە لـــــە ئـــــەنواعی نـــــەقـــائیض
ئـــــتیر چ دەلیـــــی دەرهـــــەق مـــــەفقود خـــــەجالت[4]

---

(١) غەزەل: هۆنراوەی دڵداری لەسەر یەك کێش و غـەروزە، حـوجرە، ژووری مزگـەوت شـوێنی حەوانەوەی فەقێ.

واتــە: وەرە فەرشـی خۆشەویسـتی راخـە لـەناو دڵمـدا هـەروەکو چـۆن لـە حـوجرە خـەڵك دەحەوێتەوە تۆش ئەوها وەرە بحەوێیەوە لە نێو دڵمدا کە جێگای خۆشەویستی تـۆی تێدا دەبێتەوە (فخری العلی دەبێت کەسێکی دیار و ناسراوی شاعیر بێت) سا ئـەو کەسـە بنێـرە بۆ نێو خەیاڵی خۆت بۆ ئەوەی لە خەیاڵتدا بێت.

(٢) واتە: بۆ ئەوەی دیاری پێشـکەش بکـەی وەرە هەرچـی سیفاتی جـوانی هەیـە یەکـە یەکـە بژمێرە بیکە دیاری بۆی، پاشان هەرچی سامان و ماڵت هەیە خەرج بکە بۆ داوەتکردنی.

(٣) عەد: ژماردن

واتە: ئەو دێرە پەیوەندی هەیە بە دێری پێش خۆی، من حەدم نییەکە هەتا بتوانم سیفەتە جوانەکانت بژمێرم، هەی مردووت مرێ مالۆێران تۆ چەند نەزانی هەی سلاو لە عەقڵت.

(٤) موبرا: بێ تاوان، نەقائیض: کەم و کوڕی، خەجالەت: شەرمەزار.

واتە: ئەو زاتە واتە رئیس العلما یاخود فخر العلما کەسێکە بێ تاوان و خاوێن و بێ خەوشـە لە هەرچی کەموکوڕی هەیە، ئـەی باشـە ئێسـتا چ دەڵێـی دەرهـەق شـتێکی ون بـوو تـەنها شەرمەزارییە قسە کردن لەسەری.

پێی ببێژە لەبۆ شوکت تو فەخری زەمانە
با بوەستە ئەرز و فەلەکیش چەتری جەلالت[1]
شایستەی شانت کە رئیس العلما
رێم ناکەوێ حەدم نییە تعداد فەصالت[2]
تا رۆژی قیامەت لە جەلالدا بێ جەلالت
نەیبینی ئیلاهی چە بەشەر رۆژی زەوالت[3]
پەرواز نییە بلبلی دڵ بۆ تەرەفی گول
تا دیویەتی پەروانە سیفەت شەمع جەماڵت[4]
مەقبولە لەلای فەخری جیهان شیعری (حریقی)
چت بێ هەیە مدعی بیکە سۆالت[5]

---

(١) پێی بڵێ لەبۆ شان و شەوکەت و گەورەیی فخر زەمانە، با بە سەرپێ بوەستێ لەسەر زەوی و ئاسمانیش ببێتە چەتر و سایە و سێبەر لەبۆ گەورەیی ئەو زاتە.

(٢) تعداد: ژماردن.

واتە: رئیس العلما شایستەی ئەو گەورەییە، لەبەر ئەوە من ناتوانم و حەدم نییە کە خەسڵەت و سیفاتەکانی بژمێرم.

(٣) جەلال: گەورەیی خاوەن شکۆ، زەوال: لەناوچوو.

واتە: هەتا رۆژی قیامەت ئەو گەورەی و شکۆمەندییە با لەگەڵدابێت و لێت جیانەبێتەوە، یاخود هیچ کەسێك نەبینێ رۆژی لەناوچووندا.

(٤) پەرواز: فڕین، پەروانە: پەپولە، شەمع: مۆم.

واتە: بولبولی دڵ هەردەم فڕین دەدات بۆ ئەوەی بگاتە گوڵ، جا بولبولی دڵی من هێندە عەشقی ئەو فرینە نییە بەڵکو من وەکو ئەو پەپولە وام کاتێ جوانی مۆم دەبینێت هێندە لێی نزیك دەبێتەوە هەتا باڵەکانی لە ئاگری مۆمەکە دەدات و لە عەشقی جوانیدا خۆی دەسوتێنێ.

(٥) مەقبول: پەسەند، مدعی: ئەو کەسەی داوای لەسەر خەڵك هەیە داواکار.

واتە: ئەو هۆنراوانەی من دەیڵێم زۆر پەسند و جوانە لای فەخری جیهان (دیارە ئەو

تاریکـــــه دڵــــــم ڕۆشــــــنی شمســـــــی هیـــــدایت
نقطــه ی دڵەکـــــەم مەبـــــد ءهاتوتــــه نیهایـــــەت[1]
ڕۆژم وەکـــو شــــەو وایــــه بــــەبێ شمســـــی جـــەمالت
صــــبحی ئەمــــــەلم چــــــاوەنوارە بـــــه غایـــــەت[2]
نامــــەی عەمــــەلم ڕوو ڕەشــــه وەك صـــفحەی قلــــبم
غـــەیری ڕەشـــی ڕەنگـــی نییـــه خوشـــحال و حكایـــەت[3]

---

جۆرێکـه لـه شـانازی کـردن بـه شـیعری خـۆی) دەی تـۆش داواکـار چ شـتێکت هەیـه و چ پرسیارێکت هەیە بیکە، ئەو نیوە دێرەش بێ منەتی شاعیر دەردەخات.

(١) شمس: ڕۆژ، هیدایەت: ڕێگا پیشاندان، نهایەت: کۆتایی.

واته: دڵم تاریکـه بـەهیچ شـێوەیەك تروسـکایی ڕوونـاکی تێـدا نییـه، بـەڵام بـەهۆی پرتـه و بڵێسەی ڕووناکی تۆوە ڕێگای ڕاستم پیشان دەدرێـت و ڕێگـای دڵـم لـێ ون نابێـت، چـونکه بەهۆی ئەو خاڵە ڕەشانەوە کە دڵیان داپۆشیوم گەیشتۆتە کۆتایی.

(٢) جەمال: جوان، صبح: بەیانی، ئەمەل: هیوا، غایەت: مەبەست، عەمـەل: کـردەوە، صـفحە: لاپەڕەی کتێب: ڕوو، قلب: دڵ.

واته: هەرکاتێك تۆ لێم دیار نابیت ڕۆژم لێ ئاوا دەبێـت، یـاخود هـەر کاتێـك جـوانی تـۆ کـە وەکو تیشکی ڕۆژ وایە و لێم ئاوا دەبێتو شەو دادێت، هـەرکاتێکیش بـەیانی دادێـت هیـوام نوێ دەبێتەوە پڕ بە دڵ بەمەبەست چاوەڕوانت دەکەم.

(٣) عەمەل: کردەوە، صفحەی قلب، ڕووی دڵ، لاپەڕەی دڵ

نامەی کردەوەکانم ڕەشە هەروەکو لاپـەڕەی دڵـم، جگـە لـە ڕەنگـی ڕەش هـیچ ڕەنگێکـی دیکەی تێدا نیە یاخود هەرچی کردەوە خراپەکانی ناودڵم گوازراوەتـەوە نـاو کتێبەکـەم کـە دڵم ڕەشە دەفتەرەکـەش ڕەش بـووە ئاماژەیـە بـۆ ئایـەتی ﴿يَٰوَيۡلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلۡكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحۡصَىٰهَاۚ﴾ الكهف: ٤٩، ئەوە چ کتابێکە ورد و درشتی تێدا تۆمـار کراوە، کەواتە ئەوەی دڵم هەیە هەموو چۆتە ناو کتێبەکە، هیچ سەرگوزشتەیەکی تێدا نییـه ببێتە مایەی خۆشحاڵی.

ئاهێکـــــه جگـــــەر ســـــۆز و نگاهیکـــــه دڵ ئـــــەفروز
بابـــێ لـــه طـرف تـــووه بـــه تـــاثـیرو ســـیرایەت[١]
بـــەرقی بـــەرق، دوژمـــنی دیـــن، منکـــر بـــه دبـــین
کـــەی دێتـــه ســـەر اخـــری مـــن هەســـتیم بـــه رعایـــەت[٢]
عصـــیان بـــه اضـاعـــەی دل و نســـیان بـــه اطـاعـــەت
وەك جووتـــــه بـــرا صـــحبیتان گـــەیومت غایـــەت[٣]
ســـید ســـــەندو شـــــاهدی ســـــادیقمه محمـــــد
بـــی ســـقیلی تـــو دڵ نیـــەتی درکـــی درایـــەت[٤]

---

(١) ئاهێکه: وشەیەکه لە کاتی هەست کردن بە خەفەت دەردەبردرێ، نگاه: تەماشاکردن، دڵ ئەفروز: خورپەی دڵ، لە طرف تۆوە: لەلایەن تۆوە، سیرایەت: بڵاوبوونەوەی شت.
واتە: ئاهت کە هەناسەیەکە لەسۆز و جگەرەوە دەردەچێت و بە تەماشا کردنیشت کە رووم تێ دەکەی و دەتبینم خورپە لە دڵمەوە دێت، ئەوەش هەموو بەهۆی ئەوەوەیە کە لەلای تۆوە کارم تێدەکات و بەهەموو لایەکمدا بڵاودەبێتەوە.
(٢) بەرق: بروسك، بەرقی: بریسکەدار، منکر: خراپ، رعایەت: سەرپەرشتی.
واتە: با بێ دوژمنی دین پیاوی خراپ و بەدبین هەروەکو بریسکەی بروسك و کەی کۆتایی هەتا من هەستم بە چاودێری و سەرپەرشتی کردنی.
(٣) عصیان: یاخی بوون، اضاعة: بەفیڕۆچوون، نسیان: لەبیرچوونەوە، اگاعە: گوێڕایەڵی، صبحت: گفتوگۆ، غایەت: مەبەست.
واتە: یاخی بوون و بە فیڕۆچوونی دڵ هەردووکیان لەبیر خۆت بەرەوە بە گوێڕایەڵی ئینجا هەردووکیان دەست لە ملی یەکتری دەکەن دەبنە جووتە برا و هاودەم و هاوشینی یەکتری بەمەش دەگەنە مەبەستی خۆیان.
(٤) سید: گەورە، شاهد: جوان شۆخ و شەنگ، سیقل: خاوێنکردنەوەی خەنجەر ، درك: پەی بردن، دیرایەت: تێگەیشتن.
واتە: گەورە و پیشتوان و جوان و شۆخ و شەنگە و راستگۆمە محمد(ﷺ) هەروەکو

ئـــەی پادشــــەهی مـــــولکی ویلایـــــەت بــــە عەدالـــــەت
مــــــەزلومی شــــەڕی نەفســــم و هاتومـــــە شـــکایەت[1]
کەوتومەتــــە ژێـــــر دەســــتی شــــیاطـین و نەفســــم
دەســـتێ بـــدەرە دەســــتی شکەســـتم بــــە عینایـــەت[2]

---

خەنجەر خاوێن دەکرێتەوە لە ژەنگ و پیسی ئەویش دڵ و دەروونم خاوێن دەکاتەوە، بەبێ تۆش دڵ هیچ شتێك دەرك بێ نابات و لێ تێناگات.

(١) ویلایەت: فەرمانڕەوا، عەدالەت: دادپەروەر.

واتە: ئـەی پاشـا و خـاوەن موڵـك و فـەرمانڕەوایی دادپـەروەر، مـن زۆلێكـراوم لەلایـەن نەفسمەوە بۆیە هاتوومە شکایەت کردن لە نەفس لەلایەن پادشاهەکی دادپەروەر وەکو تۆ.

ئیمامی غەزالی دەفەرمووێت: (روح و نەفس) یەکێکن، وە لەم بارەیەوە کـە هـۆی گیانـداری و ژیانە ناو ئـەبرێ بـە (رۆح) و، لـەو بارەیەشـەوە کـە فـەرمانڕەوا هەڵسوڕێنەری کـارە بـە (نەفس) ناوئەبرێ.

پاش ئەوە کە (روح) و (نەفس) یەکێ بوون لەسەر رووناکی ئایەتەکانی قورئان جار جـار بـە صفەتی (امارة) و جار جار بە صفەتی (لوامة) و جار جار بە (مطمئنة) نـاو ئـەبرێ. وە هـەر ئەوسێ نەفسە هەر ئەو نەفسەن کە لەگەڵ روحدا یەکێکن.

بەڵام لە گیانی خۆیدا بە تەبیعەت ئەمارەیە و فەرمان ئەدا بە بەجێهێنانی ئـارەزووی خـۆی. وە پـاش ئـەوە کـە بـە بەنـدەیی و تاعـەت مەشـغوڵ کـرا وای لـێ دێ لـە نێـوان ئـەحواڵی موختەلیفە ئەمێنێتەوە، لـە رووی زۆر هێنـانی هێـزی ئـارەزووی بـەدەوە ئـارەزووی بـەهێز دەبێ کاروبـاری نابـاری دێ بەسـەردا و تـاوان ئـەکا و لەبـەر هێـرش هێـزی (اطمئنـان) روو ئەکاتەوە بۆ لای هەق و عیبادەت و سەرزەنشتی خۆی ئەکا لەسەر گونـاه، وە لـەم کاتـەدا ناوئەبرێ بە (لوامة) وە ئەگەر بە تەوفیقی خودا لەم حاڵە پەسـتە رزگـار ببـێ و شـیفای بـۆ بێت و دامەزرێ ناوئەبرێ بـە نەفسـی (مطمئنـة)، جـا لێـرەدا بۆیـە نەفسـی لەوامـە هاتۆتـە پێشەوە، چونکە ئاگادارە لەسەر تاوانەکان. (تەفسیری نامی، بـەرگی٧، ل١٧٥، عبـدالکریم مدرس).

(٢) عنایەت: دەست گرتنی خەڵك بۆ سەرخستنی کاری.

واتە: من ئێستا کەوتومەتە ژێر دەسەڵاتی شەیتان و نەفسم کۆنترۆڵم لەدەست خۆم نەماوە ئەوان چییان بوێت وام هەڵدەسوڕێنن، جا ئێستا گەلێك پێویستم بە یەکێکی وەکو تۆ هەیـە

قوربـــان بـــە فـــدای قـــاپی ســـەگی قاپیەکـــەت بم
وابزانـــە ســـەگم رامگـــرە بـــۆ حفـظ و حمایـــەت(١)
وەك تـــاژی لـــە دوی صـــەیدەوە مـــن دەبمـــە تـــوفیلی
بـــەو شـــەرتە کـــەوا پـــس نـــەگریت بـــێ بەعنایـــەت(٢)
بـــێ تویشـــەم هاتوومەتـــە دەرمـــالی کریمـــان
هـــەرجارە بـــەبێ تـــوێش و دەچـــن ئـــەهلی ولایـــەت(٣)
برهـــان وەکـــو کـــەنعان شـــەرەف کەنـد لـــە مصـر بـــوو
کـــردت بـــە مەدینـــەی ئەمـــەل و کەعبـــەی غایـــەت(٤)

---

کە دەستم بگرێت و رزگارم بکات.

(١) حفظ و حمایەت: پارێزگاری و پاسەوانی کردن.

واتە: قوربان من ئامادەم خۆم بکەمە قوربانی ئەو سەگەکەی کە لەبەر دەرگاتەوەیە، هەر وابزانە منیش سەگم رامگرە وەکو سەگێك لەبەر دەرگات بۆ ئەوەی پارێزگاریت بکەم وەکو پاسەوانێك.

(٢) صەید: ڕاو، تاژی: تانجی، توفیلی: مشەخۆر (ناوی کەسێك بووە چووتە دەعوەت بێ ئەوەی دەعوەتی بکەن.

واتە: من هەروەکو ئەو کەسە مشەخۆرەم کە هەردەم لەسەر خەڵك دەژیم چۆن ڕاوکەر تاژی لە نێچیر بەردەدات کاتێك بەدوایەوە دەبیت هەتا دەیگرێ، بەڵام بە مەرجێك وەرە دەستم بگرە و ڕێم پیشان بدە.

(٣) تویشو: زەخیرە، کەریم: سەخی

من بێ زاد و زەخیرەم مایە پوچم و هیچم نییە بۆیە ناچارم بچمە بەر دەرگای کەسانی نان بدە و بەخشندە، دیارە کەسانی بێ توێشو دەچنە بەر دەرگای فەرمانڕەوایان.

(٤) برهان: مەبەست شێخ بورهانە، کەنعان: بنەماڵەی کەنعانیەکان و حەزرەتی یوسف، شەرف کەند: ناوچەیەکە و شوێنی شێخ بورهان، مصر مەبەست جێگای حەزرەتی یوسف کە تێیدا بووە بە پاشا.

واتە: شەرف کەند کە جێگای بورهانە و مصریش شوێنی حەزرتی یوسف ئەمانە هەروەکو شاری مەدینە ئاوەدان بوون کە پێغەمبەر (ص) ئاوەدانی کردەوە، بەوەش بووە جێگای هیوامان.

هــەم شەمســی بــە ئیســنادی و هــەم قــوتبی بــە ئیرشــاد
ئــەو خەرقــە بەســە بــۆ نــەزەری ئــەهلی کیفایــەت[1]
هــەم حــازر و هــەم غایــب هــەم جــەمع و پەریشــان
لــە مەجمــەعی تەقــەیوزی سـنە لــە تــۆ بــوو بــە روایــەت[2]
بــۆ باســی ســیفاتت چــە جــەلای چــە جــەمالی
هــەر عــەقلی کــە کــول بــو هــەموو کــول بــو لــە بیدایــەت[3]

(١) ئیسناد: گەڕانەوەی شتێك بۆ شتێك هـەروەکو گەڕانـەوەی حـەدیس بـۆ پێغەمبـەر(ﷺ)، شمس: رۆژ، قوتب: شیخ پـیر، خـەرق: جلوبـەرگی سـوف و دەروێشـان، نـەزەر: بۆچـوون: خەیاڵ.
واتە: تۆ هەم ناوت (شمس)ە و هەم وەکو تیشکی رۆژ وایت هـەمیش تـۆ شـێخ و پیرێکی خاوەن ئیرشادی و رێنمایی خەڵك دەکـەی، ئـەوەش باشـترین بەڵگەیـە کـە تـۆ لـە لوتکـەی ساکاری دایت جلـی دەروێشـتان لەبـەر کـردووە، ئـەوەش بەسـە بـۆ ئـەو کەسـانەی بـیر دەکەنەوە.
(٢) واتـە: تـۆ لـەکاتی ئامادەبوون دیـار نـەبوو و لـە کـاتی کۆڕبەسـتن و تـەنهایی لـە شـوێنی کۆبوونەوەی خەڵکی سنە باس دەکرێیت و ناوت دەهێنن.
(٣) کول: وەکو دەڵێن ئەو چەقۆیە کول بووە واتە تیژی نەماوە، کول: گشت.
واتە: باسی گەورەیی سیفاتت چ گەورە و جەلال یـاخود چ بـە جـوانی خورەوشـتت جمالـت هەر عەقلێکیش کە بیری نەکردەوە و بێ کەڵك بـوو لـە هـەردوو سیفاتی جـەلال و جـەمالت ئەوە هەموو بۆ سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە.
لەنێوان کول و کول جیناسی تەواو هەیە.

سـەد هـەروەکو مەنسـور و هـەزار وەکـو شـبلی
جـا رووکەشـی دەرکـەن بـە هـەوای دەرک و دیرایـەت[1]
سـەردانێ لـە مەیـدانی مریـدانی (حـەریقی)
بـۆ گـوی شـەقین چـاکە خۆشـت وت بەکنایـەت[2]

---

(١) مەنسوری کوڕی حەلاج لەساڵی ٣٠٩کۆچی لە دایك بووە و لەساڵی ٩٢٢ زاینی لە سێدارە دراوە، یەکێکە لە سۆفیە بەناوبانگەکان.
ئەبوبەکری شبلی لەساڵی ٨٦١ لەدایك بووە و لەساڵی ٩٤٥ زاینی کۆچی دوایی کردووە ئەویش هەر سۆفی بووە، دەرك: حاڵی بوون، دیرایەت: تێگەیشتن.
واتە: سەد کەسی وەکو مەنسوری حەلاج و هەزاری وەکو ئەبو بەکری شبلی ئەوانە با خۆیان دەرخەن ئەو رووکەشە لەسەر خۆیان لابەن بە هەواو خۆشەویستی تێگەیشتن لێك حاڵی بوون.
(٢) کنایەت: وشەیەکە بۆ مانا و مەبەستی دیکە بەکاردێت.
حەریقی وەرە مەیدانی موریدانی خواپەرست، دەی ئێستا ئەوانە واباشە بەڕەڵلا بکرێن، جاران ئەگەر حوشتر سك و زای زیادی بکردایە لەنێو عەرەبەکان گوێی شەق دەکرا و بەرەڵلا دەکرا و کاری پێ نەدەکرا دەی ئەو قسەیەت زۆر خۆشە کە بە کینایە دەیکەی.

# پیتی دال

چاوەکەم ئەمڕۆ لە گوڵشەن گوڵ بە عیشوە خۆی نواند
نەک نمەک گیر بم، بە مەرگی تۆ قەسەم، هیچ نەمدواند[1]

گوڵ بە تۆزی پێتەوە لاف و گەزافی لێ ئەدا
وا شوکر و سوزی نەسیم هات و ئەویشی لێ ستاندا[2]

نەشتەری موژگانی تۆ هاتوتە سەر سەفحەی دڵم
هەر خەتی بوو، غەیری خەتتی سەبزی تۆ پاکی کراند[3]

لەشکری ئاهم لەگەڵ جەیشی حەبەش دەعوا ئەکا
حیرەتم ماوە کە چۆن ئەو دلبەرە دڵمی رفاند؟[4]

---

(١) گوڵشان: شوێنێك پڕ لە گوڵ و گوڵزار بێت، عیشوە: بە شۆخ و شەنگ سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی راکێشێ.

واتە: چاوەکەم ئەمڕۆ لە ناو گوڵ و گوڵزاردا گوڵم دیت زۆر جوان بوو، خۆی رازاندبۆوە و سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی رادەکێشا نازی بەسەر خەڵکدا دەکرد، بەڵام بۆ ئەوەی نمەکی تۆ نەمگری سوێند بە مەرگی تۆ من خۆم تێنەگەیاند و قسەم لە گەڵدا نەکرد.

(٢) لاف و گەزاف: خۆهەڵکێشان، نەسیم:شنە

گوڵ ئەو لاف و گەزان و خۆهەڵکێشانەی بەوە لێدەدا کە تۆزی پێی تۆی پێوەبوو، بەڵام سوپاس بۆ خوا ئەوا بەهۆی هاتنی شنە بای تۆوە ئەوەشی نەما و پشتی لێ ستاند کەواتە کە جاران بەهۆی تۆوە ئەو لاف و گەزانەی لێ دەدا، ئێستا ئەوەی نەما، لەمەولا چی دەکات؟

(٣) موژگان: برژانگ، سەفحە: روو

واتە: برژانگەکانت وەکو تیر وایە و دەیهاوێی دەیدەی لەسەر رووی دڵم هەروەکو ئەو تازە موانەی کە تازە لەسەر رووی گەنجانی تازە دێت.

(٤) ئاه: ئەو هەناسەی لە دڵ و دەروونی خەماوییەوە دێتە دەرەوە، حیرەت: بە سەرسورمان

بــۆ گـــوڵی رووت هــــاتم و پەرچـــەم دەبیـــنم بۆیـــە وا
مـــاهی نــــەورۆزم بەشـــێوەن وەک محـــرم خــۆی نوانـــد[١]
تــۆ لــە ئــەوەل گــری وەفـــات هینایـــە نیـــو مەیدانـــەوە
ئێســتا چــەوگانی خیلافــەت پشــتی ســەد وەعــدی شـکاند[٢]
توخـــوا قـــەت غیرەتـــە بـــۆ تـــۆ ئـــەری ســـەرووی رەوان
گــوڵ بـــەبێ تـــو وا لـــە باغـــا خیـوتی خــۆی لــێ چــەقاند[٣]
بـــا وجـــود ئینســــاف بـــدەم چـــاکە گـــولیش موشـــتاقتە
هـــەر لـــە شـــەوقی تۆیـــە ســـەرپۆش و گرییـــانی دراند[٤]

---

لەشکری ئاهم واتە ئەو دەنگەی لە دەمم دێتە دەرەوە لەگەڵ سوپای حەبەشە هەردووکیان بەیەکەوە دەعوا دەکەن، منیش سەرم لەوە سورماوە کە ئەودولبەرە نازادارە بە چ شێوەیەك دڵمی فڕاند و لێی ستاندم.

(١) من بە خەیاڵی رووی تۆ هاتم وەك گوڵ گەش و جوانە بەڵام کاتێك هاتم پەرچەمت کە رەشە بەسەر رووتدا هاتۆتە خوارەوە جوانی رووتی شاردۆتەوە مانگی نەورۆز کە سەرەتای بەهارە دەشت و دەر رازاوەتەوە وەکو جوانی رووت بەڵام بەهۆی پەرچەمتەوە ئەو مانگی نەورۆزە بۆتە مانگی محرم کە مانگی شین و ماتە خەڵکی رەشپۆشە.

(٢) چەوگان: گۆپاڵ دارێکە سەری چەماوەیە، وەعد: پەیمان.
واتە: تۆ بووی یەکەمجار قسە و باسی وەفات خستە سەر باس و هێناتە مەیدانەوە ئێستاش وەکو ئەو دارە خوار بوویتەوە واتە راست نەبووی بۆیە ئەو قسانەی لەمەوپێش دەتکرد و پەیمانت لەسەردا بوو هەموو بە پێچەوانەوە بوو خاوەنی پەیمانی خۆت نەبووی.

(٣) سەری رەوان: باڵا بەرزی دڵبەر
واتە: توخوا ئەوە چ غیرەتێکە بۆ تۆ ئەی دڵبەری باڵا بەرز و رێك و پێك، گوڵ بەبێ ئامادەبوونی تۆ هاتووە لە باغدا لێی دانیشتووە رەشماڵی لێ هەڵداوە واتە هیچ حسابێکی بۆ تۆ نەکردووە و بە هیچت نازانێت، تۆش بە چ غیرەتێك قبوڵت دەکرد؟

(٤) واتە: با ئینسافەوە دان بەوە بنێم گوڵیش ئارەزووی بینینی تۆیە حەز دەکات جوانی تۆ ببینێت، هەر لەبەر جوانی تۆیە گوڵ سەرپۆشی سەری خۆی فڕێدا و جوانی خۆشی بەدیار

هەرکەســـی مایـــل بـــە بیرێکـــە و تـــەریقێکی هەیـــە
تـــۆ بـــە شـــوعلەی غـــەم (حـــەریقی) وەجاخـــت هەڵگرانـــد[١]

بـــەو نـــورە کـــە ظـــاهر بـــوو لەســـەر رووی محمـــد
عالـــەم هـــەموو ئاشـــقتە بـــوو وەك مـــووی محمـــد[٢]

مـــەخجول و ســـەر ئەفگەندەیـــە نەســـرین و بنەوشـــە
بـــو مـــووی ســـەمەن بـــوی دوو گیســـوی محمـــد[٣]

مـــەجذوبـــە هـــەموو کـــەس بـــەرموزو بـــە ئیشـــارە
مـــەجبورە لـــە دەس ســـاعید و بـــازوی محمـــد[٤]

---

خست، سەرپۆشی گوڵ کاتێك خونچە دەکرێتەوە پەری گوڵ بەدیار دەکەوێت جا کرانەوەی خونچە فرێدانی سەرپۆشی گوڵە.

(١) مایل: مەیل، شوعلە: کڵپەی ئاگر.
واتە: هەر کەس مەیلی بەلای بیرێکەوە دەڕوات و یا خاوەنی تەریقەتێکە، ڕێبازێکی هەیە، تۆ بە کڵپەی ئاگری غەم (حەریقی)ت وەجاغت لەناوبرد.

(٢) ظاهر: ئاشکرایە، ئاشفتە: دوچار ژیانی سەخت.
واتە: ئەو رووناکییەی کە بەدیارکەوت لەسەر روو دەم و چاوی محمد(ص) خەلکی کە ژیانیان لە سەختی و نارەحەتیدا بوو گەلێك ناچاری ئەو محمدە بوون.

(٣) خجل: شەرمن، سەرفگەندە: سەرلێشێواو، سەمەن: دەرختێکی بچووکە و گوڵەکانی بۆنیان خۆشە، دووگیسو: پرچی درێژ.
واتە: گوڵی نەسرین و بنەوشە هەستیان بە شەرمەزاری و سەرلێشێواوی کرد، ئەو کاتەی رووی جوانی و موەکانی (محمد) یان دیت.

(٤) مجذوبە: راکێشان مەبەست ئەو کەسەی سەوداسەری عەشق بێت، رموز و ئیشارەی درکاندی رازی نهێنی بە پیشاندنی شتێك بە چاو یاخود بە دەست، مەجبور: ناچار، سەعید و بازو: دەست و باسك.
واتە: هەرکەسێك عەشقی ئەو محمدەی هەبێت و سەوداسەری خۆشەویستی لە دڵدا بێت ئەوە ناچاری پێویستی بەهێز و باز و باسکی ئەو دەبێت گەر بە ئیشارەتێکیش بێت.

سەروی چیمەنیش لە گوڵ و خاری غەمایە
لەرزیانە لە حەسرەت قەدی دلجوی محمد[1]

لالەش وەکو من سینە پڕ حەسرەت و داغە
تا دیویەتی روخساری گولبوی محمد[2]

گردی ذقن سپی پرر ئەسپی عەجایب
زەخمی هەیە بۆ شاه و گەدا کوی محمد[3]

زاهد وەرە پێش تۆ سەری ئیمانی زەعیفت
روو بکە لە میحرابی دوو ئەبرۆی محمد[4]

---

(١) سەرو: دەرختێکی گەلا باریك و تیژە، چیمەن: سەوزایی، خار: دڕك و داڵ، حەسرەت: داخ و خەفەت، دل جوی: ئەو شتەی دڵ دەیەوێت و پەسندی دەکات.

واتە: داری سەروی ناو چیمەنیش کە پێوی لەناو گڵ و دڕك و داڵی غەمدایە، لەرزە لەرزیانە لە داخ و خەفەتی ئەو بالاّییەی کە دڵ حەزی لێ دەکات.

(٢) لالە: گوڵاڵە: چرا، سینە: سینگ کە دڵی تێدایە، گوڵبوی: بۆنی خۆش واتە گوڵاڵە سورەش کە بۆنێکی خۆشی هەیە هەروەکو دڵ و دەروونی پڕ لە ئاه و خەفەت و حەسرەت لەو ڕۆژەوەی کە روخساری جوانی محمدی دیوە و لە بۆنی خۆشی تێر نابێت ئەوە وای کردووە دڵمان پڕ لە ئاه و حەسرەت بێت بۆ ئەوەی جارێکی دیکە پێی شاد ببێتەوە.

(٣) گردی ذقن: چەناگەی خڕ و جوان، زەخم: برین.

واتە: چەناگەی خڕ و جوانی و سپی لەشتی جوان کە بۆتە جێگای سەرسوڕمانی خەڵك کە ئەوە وای کردووە برینێك بۆ شاه کەوا ئەمەش هەر بە محمد سارێژ دەکرێت ئەو برینە.

(٤) زاهید: خواپەرست و تەرکی دونیای کردبێ و ﴿ وَشَرَوۡهُ بِثَمَنِۭ بَخۡسٖ دَرَٰهِمَ مَعۡدُودَةٖ وَكَانُواْ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ﴾ (یوسف: ٢٠).

واتە: ئەی کەسی تۆبەکار کە دەستت لە دونیا شوشتوە وازت لێ هێناوە وەرە پێش ئەوەی سەری ئیمانی زەعیفت دابنێ لە روویەکی میحرابی نێوان برۆکانی محمد واتە خۆت بدە بە دەستی محمد هەتا ئیمدار بێت

بورهانــــە لەســــەر نفــــی منافــــات شــــەو و رۆژ[1]
مــــوویی کــــە پەرێشــــانە لەســــەر رووی محمــــد
عالــــەم وەکــــو مــــن جــــەرگی بــــراوە بــــە نیگــــاهو
رم کــــردن و ئێســــتا ئــــاهوی محمــــد[2]
روح و دڵ و دینــــت هەیــــە هەرســــێکی (حــــەریقی)
خــــەرجی کــــە لــــە رێــــی و صــــف و ثنــا جــــوی محمــــد[3]

---

(١) بورهان: گوندێکە لە وڵاتی موکریان شێخێکی لێ بووە بە ناوی شێخی بورهان، ناوی یوسف کوری محمدە، لە ساڵی ١٣٤٢کۆچی لە ئاوایی لاجان لە دایك بووە، دەچێتە هەورامان لەسەر دەستی شێخ عوسمان سیراج الدین تەمەسوك دەکا خەریکی ئادابی تەریقەت دەبێ، لە ساڵی ١٣٢٨ کۆچی کۆچی دوایی دەکات، حەریق یەکێك بووە لە سۆفیەکانی شێخ بورهان، نەفی: دوورخستنەوە لە شارێك بۆ شوێنێکی دیکە، منافات: یەکتر دوورخستنەوە.
واتە شێخی بورهان هەردەم لەسەر دوورخستنەوەیە بەشەو و بە رۆژ موو پەرش و بڵاو بوو پەرێشانە کاتێك رووی پێغەمبەر ئیشارە بەوە بنێت کە هەر کاتێك دەچێتە خەڵوەوە و رووی جوانی پێغەمبەر (ﷺ) دەبینێت زۆر پەرۆشی ئەوەیە کە بێگاتێ و بە خزمەتی بگات.
(٢) نیگاه: تەماشا کردن، ئیسناد: گەڕانەوەی شتێك بۆ شتێك، اهو: مامز
واتە خەڵکی هەروەکو جەرگیان براوە و ئاگایان لە خۆ نییە بۆ تەماشاکردنی رووی جوانی پێغەمبەر(ﷺ) هەروەکو چۆن ئاسك رمی تێ دەگرێ بۆ راو کردنی خەڵکی بەو شێوەیە عەوداڵە بۆ بینینی محمد(ﷺ).
(٣) حەریق هەستە بە یەك جار روح و دینت و دڵت کە هەیە هەرسێکی بە جارێك خەرج بکە لە پێناو و لە رێگای وەسف و ستایشی پێغەمبەر(ﷺ).

# پیتی راء

عشــقت کــه حــەقیقی بــی تالــب مەبــه ئـیلا کــورِ
هــەم حــەزرەتی لــەولا کــور و هــەم یوســف والاکــور[1]
ئــەو نــورە کــه مەنشــه ءبــوو بــو عاشــقی مەبــدءبــوو
تــی فکــره لــەو نــورە مــەعلوم و هویــدا کــور[2]
عەشــقی کــه بــەقوەت بــی مایــل بــه مــروەت بــی
نــەم دیــوە کــه تالــب بــی ئـیلا کــه تەلــەب کـا کــورِ[3]

---

(١) ئەو هۆنراوەیە وەڵامی عەزەلێکی(نالی) بەحەریق هەوڵی داوە دێربەدێر وەڵامی نالیبداتەوە من وای بۆ دەچم مەبەستی حەریق ئەوە بێت کە بە خەڵك بسەلمێنێ کە هۆنراوەکانی لە ئاستی هۆنراوەی (نالی)یە، یاخو دبڵێن هۆنراوەکانی شان لە شانی نالی دەدات.
واتە کە تۆ عاشقێکی بەراستی جگە لە کورِ تـالبی هـیچ کەسێکی دیکە مەبە ئـەی نـابینی حەزرەت لە رەگەزی نێرە هەم یوسف جوان و باڵا بەرزیش دیسان کورِ، دەکرێـت ئـەوەش بگوترێت کە حەزرەت کورِ بووە، ئاماژە  بە فەرموودەی (لولاك لـولاك لمـا خلقـت (الأمـلاك) واتە ئەگەر نەمازنیا تۆ لە دایك نابێـت گـەردونمان دروسـت نـەدەکرد، فـەرموودە ناسـەکان دەڵێن ئەوە فەرموودەیەکی زەعیفە.
ئەگـەر وەك رەخنـەی کۆمەڵایـەتی تەفسـیری واقعـی کۆمـەڵگای کـوردەواری بکـەین ئـەو بۆچوونەی (حەریق) تەواو دروستە، چونکە سەردەمی حەریق واقعی کۆمەڵگای کـوردەواری زیاتر مەیلی بەلای کورەوە بوو، بەوە دڵخۆش بووە کە ببێتە خاوەن خاوەن  پشـت و پـەنا کە بەرامبەرەکەی حسابی بۆ دەکات بەڵام  ئەوە لە خاوەن کچ چاوەروان ناکرێت.
(٢) ئەو نورە کە هەڵگیرسا لە شوێنی بەدیارکەوتنی ئەوە بو عاشقێکی خاوەن بیرو بـاوەرِ، جـا وەرە تۆ تێفکرە لەو نورە کە مەعلوم  و ئاشکرایە کە کورِە.
(٣) مایل : ئارەزووی شت بکات، مروەت: پیاوەتی.
واتە: هەر عەشـقێك ئەگـەر بـەهێز بێـت هـەردەم ئـارەزووی ئـەو شـتە دەکـات کـە جێگـای پیاوەتی و جوامێری بێت دیارە ئەوەش دەبێت هەر لە کورِ بوەشێتەوە بۆیە جگـە لـە کـورِ داوای هیچ شتی دیکە مەکە.

عەشــقی کــە بــە غــەوغا بــوو وەک عەشــقی زلێخــا بــوو
سەرگەشـــــتە و ریســــوا بـــۆ یوســــف والا کـــورِ[1]
شــیرین کــە شــەکر رێــز بــوو بــۆ کــێ بــوو دڵ ئــاوێز بــوو
بــۆ خوســرەوی پــەروێز بــۆ فــەرهادی هــەوا خــوا کــورِ[2]

---

(١) غەوغا: ئاژاوە، زلێخا: کچی (تیموس)ی پاشای مغرب بوو و ژنی (بوتیفار)ی عەزیزی مسر بوو.
زلێخا عاشقی حەزرتی یوسف بوو، بەڵام حەزرەتی یوسف نەیدەویست خیانەت بکات، لە ئەنجامدا زلێخا هەوڵی ئەوەی دا لە ماڵەکەی خۆیدا کردەوەی خراپی لەگەڵدا بکات، بەڵام حەزرەتی یوسف خۆی نەدا بە دەستەوە و رایکرد بەڵام زلێخا لە پشتەوە کراسەکەی راکێشا و دڕاندی، پاشان گوتی یوسف دەستدرێژی کردۆتە سەرم، پاشان منداڵێك شاهیدی لەسەر ئەوەدا ئەگەر حەزرەت کراسی لە پێشەوە دڕا بێت ئەوە حەزرەتی یوسف خەریکی دەستدرێژی بووە بۆ سەر یوسف وە ئەگەر کراسەکەی لە پشتەوە دڕا بێت ئەوە حەزرەتی یوسف هەوڵی داوە خۆی رزگار بکات و زلێخا لە پشتەوە رایکێشاوە ﴿وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٍ فَكَذَبَتْ وَهُوَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ (یوسف: ٢٧).
سەرگەشتە: سەرگەردان، ریسوا: شەرمەزار.
هەر عەشقێك ئەگەر بە گێرە و کێشە و ئاژاوە بوو هەروەکو عەشقی زلیخا بۆ یوسف کە سەرگەردان و ریسوا و شەرمەزاری بوو، بەڵام بالا بەرز و جوان کورِ بوو سەربەرز بوو.
(٢) شەکەر رێز: قسە خۆش، دڵ ئاوێز: دڵی بە کێوە بوو، خوسرەوی پەروێز: ئەوەی نەوشێروانی دادپەروەر، لە سەردەمی ئەودا پێغەمبەر (ص) لە دایك بووە، خاوەن شکۆ بووە، دەوڵەمەندی و گەنجینەکانی بوون بە ئەفسانە دڵداری لەگەڵ شیرین بووە بە سەرچاوەی چیرۆکی شعیر لە ئەدەبیاتدا، فەرهەنگی نالی دیوانی نالی، د. مارف خەزنەدار.
فەرهاد: ناوی هونەرمەندێك بووە لە سەردەمی خوسرەوی پەروێزدا، عەشقی شیرین بووە، هەروەکو خوسرەو عاشقی شیرین بوو، دەڵێن خوسرەو فەرمانی بۆ فەرهاد دەکرد کە شاخی بێستون هەڵکەندێ و هەروەها ناوی پێنجەمین پاشای بنەماڵەکەی ئەشکانیەکان بووە.
واتە: شیرین قسەی خۆشی بۆ کێ دەکرد، دڵی بۆ کێ دەچوو عەشقی کێ بوو، هەر بۆ خوسرەوی پەروێز لایەنگیری فەرهاد نەبوو!

کــــچ مـــــایلی والایــــــە وەک داوی بــــــەلا وایــــــە
کــور وەک کــوڕی شــا وایــە بــێ خــەوف و محابــا کــوڕ[1]

کــچ تــەبعی کــەچ و نــاقص کــوڕ تــەبعی تــەر و خــالص
هــام صــحبت هــەم جــالس خــۆش منظــور ســیما کــوڕ[2]

کــــچ زوڵفــــی پەرێشــــانە کــــوڕ پەرچــــەمی ئەفشــــانە
کــاکول بــــە جەمعیــــەت هــــەم شــــان کچــــە یــــا کــــوڕ[3]

کــــچ صــــاحب لەرزانــــە کــــور مــــەردە لــــە مەیــــدانا
کــور هــام دەمــی ئینســانە خــۆش مەشــرەب و گویــا کــور[4]

---

(١) مایل: مەیل، بەلا: گرفت، خەوف: ترس

کچ ئارەزوو مەیلی والایە و ئاشکرایە، ئەوەش وای کردووە ببێتە بەلا بۆ خاوەنەکەی واتە کچ هەردەم دەبێت ئاگاداری بێ نەوەکو داوی بۆ دابنرێتەوە کەس و کاری تووشی بەلایەکی کۆمەڵایەتی بکات، بەڵام هەرچی کوڕە ئەوترسەی لەسەر نییە لێی بێ غەم بە مەترسە لێی هەروەکو کوڕی شا وایە.

(٢) ناقص: کەم، خالص: بێ گەرد، صحبت: گفتوگۆ.

واتە: کچ لە سروشتی خۆیدا تەبیعەتی کەچ و ناتەواوە، بەڵام هەرچی کوڕە تەبیعەتی تەڕ و جوان و بێ گەرد لە هەمان کاتیشدا لە هاونشین و گفتوگۆ دا سەر و سیمایەکەی جوانن هەیە بۆیە دەبێت کوڕ پەسند بکەین.

(٣) پەرێشان: زولفی ئاڵۆز و شێوا، ئەفشان: بڵاو و پەخشان، کاکۆڵ: پەرچەم کە دێتەوە سەر نێو چەوان، هام شان: ئاوکوف.

واتە: کچ زولفی ئاڵۆز و شێواوە بەڵام پەرچەمی نیە هەتا بشێوێت بەڵکو کوڕ پەرچەمی هەیە و بڵاوبۆتەوە پەرچەمیشی بە شێوەیەکی گشتی دێتە سەر نێو چەوانی با ئێستا وەرە بڕیار بدە کوڕ یان کچ ئاوکوفە.

(٤) لەرزانە: جولانەوەی لە جێگای خۆی، هاودەم: هاونشین، خۆش مەشرەب: قسە خۆش.

واتە کچ خاوەنی جولانەوەی خۆیەتی لە شوێنی خۆی، بەڵام کور وانیە پیاوی مەیدانە کەواتە لە رۆژی لێ قەوماندا کچ بە کەڵکی ئەوە نایەت بێتە مەیدان و بەرگری بکات، بەڵام کوڕ وانیە پیاوی مەیدانە لە رۆژی تەنگانەدا.

**هەرکەس بە تەبیعەت بۆ ئەرباب‌ی مرووەت بێ**
**لەم نقتە تەماشا کا خانم کچ و ئاغا کور**(١)

**قامەت کە وەکو نەی بی کێ دیویە لەگەڵ بەی بی**
**ئەم نیسبەت ئەخلاقە دەرحەق کچە یا کور**(٢)

**سەد حەیفی کە تۆ (نالی) بەوپیرییە مندالی**
**بەم تەرزە لە عەشق ئەدوی زیبا کچ و دیبا کور**(٣)

---

(١) ئەرباب: خاوەن، مروەت: پیاوەتی جوامێری.
واتە هەر کەسێك خاوەنی خورەوشت و تەبیعەتێکی جوان بێت و هەروەها خاوەنی جوامێری و پیاوەتی بێت ئەەوا لەو نوقتەوە تەماشا بکە کچ وەکو خانمان دادەنیشێ بەڵام کوڕ وەکو ئاغا خاوەن دیوەخانە و میوانی دێت و میوان بەرێ دەکات و خەڵك دێنە سەر سفرە و خوانی.
(٢) قامەت: باڵا، نەی: شمشاڵ واتە باریك و ڕێك و جوان.
واتە کێ دیویەتی بەژن و باڵایەك کە وەکو شمشاڵ باریك و جوان و ڕێك و پێك بێت ئەو جوانی ڕێك و پێکییە لەگەڵ بۆنی خۆش لە کێ هەیە! دیارە ئەو نیسبەتەی باڵا شمشاڵی بۆنی خۆش ئەخلاق بەرزییە بۆ کێیە کچ یا کوڕ!
(٣) بەم تەرزە: بەم جۆرە، زیبا: جوان دیبا: قوماش ئاوریشم.
واتە سەد جار حەیف و مخابن بۆ تۆ نالی ئێستا پیری بەڵام بیرکردنەوەت مندالانەیە بەو جۆرە بیر لە عەشق دەکەیتەوە و لێی دەدوێی چونکە ئەگەرچی کچ جوان، بەڵام کوریش وەکو قوماشی ئاوریشم وایە کاتێك لەبەر دەکرێت عەیبی دادەپۆشی یەکێك لە میکانیزمەکانی بەرگری (نکوص)ە، واتە گەڕانەوە بۆ سەردەمی منداڵی (ناڵی)یش کە بەو پیرییە لەعەشق دەدوێ گەڕاوەتەوە سەردەمی منداڵی.
بەڵام لێرەدا پرسیار ئەوەیە (حەریق) بەڵگەی چییە کە ناڵی ئەو هۆنراوەیەی لە سەرەوەی پیری گوتبێ، لە کاتێکدا لێکۆڵەرەوانی شیعری نالی دەڵێن تەمەنی نالی لە ٥٦ ساڵ تێنەپەڕی نەکردووە، دیارە ئەوەش جێگای پرسیار و هەموو کەس قەناعەتی پێ ناکات.

مـــووی کـــه لـــه رووی کـــورِ بـــێ ریحانـــەی نیـــو باغـــه
ســـەد جـــەرگی لەبوداغـــه صـــاحب خـط و ئینشـــا کـــور[1]
بـــۆ خلـــوەتی تـــەنیایی فی الواقعـــه کـــچ چـــاکه
ئـەما کـه لـه عەشـق بـدویی ئـەدنا کـچ و ئـەعلا کـور[2]
بـــۆ خـــەلوەت تـــەنیا کـــچ بـــۆ بـــەزمی تەماشـــا کـــور
بـــۆ فاســـقی ریســـوا کـــچ، بـــۆ عاشـــقی ســـەودا کـــورِ[3]
کـــچ وەخـــتی شـــکا ســـەدی نـــامینی چـــه ســـەرحەدی
نەقســـــی نیـــــەتی عـــــەدا مـــــەحفوز و موبـــــەرا کـــــورِ[4]

---

(١) خط: دێر، ئینشاء دروست کردن.
واته هەر تاڵە مووێك گەر له رووی کورِ بێت، ئەو تاڵە مووە وەکو ریحانەی رەش وایه که لـه نێو باغدا هەبێت که بۆن خۆش دەکات دیـاره خـەڵکیش دڵـی دەچـێته بـاغ و بـۆنی خـۆش بەهەمان شێوه کورِیش سەد جەرگ بۆ داغه، چونکه ئەو له خۆیەوه شت دادەهێنێ.
(٢) خەڵوەت: تەنیایی، فی الواقعه: له راستیدا، ئەدنای: ژێر، اعلی: بەرز.
له راستیدا کچ بۆ کاتی تەنهایی زۆر باشه که ببێته هاونشین و هاودەمی کور بەڵام که بێتـو له عەشق و خۆشەویستی بدوێی ئەوه کچ له ژێرەوه و کورِ له سەرەوه
(٣) ریسوا:شەرمەزار، سەودا: عشق و شەیدایی.
بۆ کاتی تەنیا کچ باشه بۆ ئەوەی جێگای بەتاڵ نەمێنێ کـورِیش بـۆ بـەزم و تەماشـا کـردن کچ دیسان بەدەستی کەسی فاسق و ریسـوا شـەرمەزار دەبێـت بـۆ عاشـقی و شـەیدا بـوون دیسان کورِ.
(٤) مەحفوز: پارێزراو، موبەرا: کەسێك له تاوان دوور بێت.
هەرکاتێك کچ کاتی شکا و بەسەرچوو واته کچێنی نەما تـامی نامێنـێ، کـه ئـەوەش دوژمـن ئەوه به کەمی دەزانی بەڵام کورِ هەردەم مەحفوز و بێ تاوان دەتوانی خـۆی پیشـان بـدات یاخود به مانایەکی دیکه کچ شەرمی لـه نـاو خۆیەیـەوه هەسـتی پـێ دەکرێـت ناتوانرێـت بشاردرێتەوه بەڵام کورِ وەکو کچ نییه دەتوانێت بێ تاوانی خۆی پیشان بدات.

لــەم تــەبعی کــە چــە لادە عــومرت هــەموو بــەبادە
خــوی ســاقی و چــاو بــادە مضبوط، مهیــا کــورِ[1]

ئــەم عەشــقە مجازاتــە ئــەنجامی مەجازاتــە
غواســی حقیقــت بــە دورِ دانــەی دەریــا کــورِ[2]

هــەر عیشــقێ حــەقیقی بــێ وەك (حــەریقی) بــێ
مــەیلی بــە دەقیقــی بــێ بــۆ مەعریفــە و تــوللا، کــور[3]

---

(١) ساقی: مەی گێڕ، بەرباد: لەناوچوون، مهیا: ئامادە.
واتە  ئەو تەبعەی کەچ و خراپەی کە هەنە  دەستی لێ هەڵبگرە تەمەنت هەموو لە ناوچوو بەبێ سوود، خۆی مەی گێڕ و سەرمەستە کوڕیش رێك و پێك و ئامادەیە.

(٢) ئەو عەشقەی تۆ باسی لێوە دەکەی خۆشەویستییەکە دوور لە راستی هەرچەندە خۆتی پێوە ماندوو بکەی بە خۆڕاییە چونکە ئەنجامەکەشی هەر دوور لە راستی یاخود بڵێن خۆشەویستیەکەی تۆ کە خۆت پێوە خەریك کردووە دامەزراوە لەسەر شتی بۆش و هیچ دیارە ئەنجامەکەشی هەروا دەبێت یاخود وەکو خانوەك لەسەر گوفەك دروستی بکەی زوو دەرمێ و دەروخێ.

(٣) هەر عەشق و خۆشەویستییەك ئەگەر راست و دروست بێت وەك عەشقی حەریقی کە هەیەتی بۆ خۆشەویستەکەی دەبێت مەیل و ئارەزووی زۆر ورد بێت بۆ ناسینی خوای گەورە، دیارە ئەوەش هەر لە کور دەوەشێتەوە.

تەعاروف بە سیغارە شیعاری ئەهلی کیبار
سەبیلی عادەتی مەسدودە بۆ رەواجی سیغار[1]
لە قاوەی قاوەچی هەرکەس کە مەشرەبی چا بێ
بە دودی قەنەنە تەناعەت ئەکا فقیر و هەژار[2]
میزاجی ئادەمی خاکی هەوا و ئاو و بادە
عینان سەبر بە دەس باکیشتە کوورەی نار[3]
بە موڵک حیدەت ئەگەر ئاشنایی مونکری حال
دەزانی عومری عەبەس بوو لە کوسرەتی ئەغیار[4]

---

(١) تەعاروف: یەکتر ناسین، سیغارە: جگارە، شیعار: دروشم، ئەهلی کیبار: پیاوی گەورە، مەسدود: داخراو، رەواج: برەوپێدان.
واتە برادەرایەتی یەکتر ناسین یان هاونشینی لەگەڵ جگارە ئەو دروشمی کەسانی و پیاوانی گەورەیە کەواتە هەر کەسێك هاوڕێیەتی پیاوانی گەورە بکات دەبێت پێش وەختە لەگەڵ جگارە یەکتریان ناسیبێ.

(٢) مەشرەب: هەڵسوکەوت، دودی: دووکەڵ.
واتە هەرکەسێك لە دیوەخاندا هەڵسوکەوتی باش بێت دەتوانێت لەگەڵ قاوەچی هەڵبکات و قاوە بخواتەوە، کەسانی هەژار و فەقیریش دەتوانێت قەناعەت بکات رازی بێت بە دوکەڵی جگارە کاتێك ئازار دەدرێت بە دووکەڵەکەی.

(٣) میزاج: زەوق، هەوا: ئارەزوو، بادە: نۆش کردن، عینان: ئەو پەتکەی کە ولاغی پێ لغاو دەکرێت، کوڕەی نار: ئەو شوێننەی ئاگری تێدا دەکرێتەوە.
واتە بەنی ئادەم زەوق و میزاجی ئەوەها کە خۆشەویستی و ئارەزووی بۆ خاکەکەی دەچێت نەوەکو ئاو نۆش بکات هەتا دەگاتە ئەو کاتە کە پەتکی لغاوی ولاغەکەی وەکو با دەیگەیەنێتە سەر کورەی ئاگر نزیك دەبێتەوە لە سوتان.

(٤) حیدەت: توند و تیژی، مونکیر: کاری خراپ، عەبەس: کاری بێ سوود، ئەغبار: بێگانە.
واتە: هەموو موڵکێك ئەگەر بە توند و تیژی بەدەست بهێنرێت هەروەکو ئەوە وایە کە ئاشنایەتی کەسی خراپ بکەی دیارە هەر کەسێکیش هاونشینی کەسی خراپ بێت حاڵی چۆن دەبێت؟ دیارە حاڵی ئەو کەسە وەکو ئەوە وایە کە تەمەنی خۆی لە بێ هودەیی سەرف بکات یا خزمەتی بێگانە بکات.

زەرەری نـــەبێ ســــەمەرێکی نیـــە دەرختـــی غـــەیر
ئەگـــەر بـــە بـــەرد و پـــلار سەرچـــل بخەیتـــە خـــوار[1]
دەرخـــــتی مـــــولکی دلم میوەیـــــەکی کـــــالی هەیـــە
خـــوا بکـــا بـــە تەحـــەمول بگـــا بـــە ســـەبر و قـــەرار[2]
بـــــە داغ و حەســـــرەت دەچـــــمە حەلقـــــەی ماتـــــەم
ســـەفایەکی نـــەبوو ســـەعییم لـــە تـــەرەف کـــوی نیگـــار[3]
لـــــە وەخـــــتی عالـــــەم ئەرواحـــــەوە هـــــەتا ئێســـــتا
ســـــەفەر ئەکـــــەم نەگەیشـــــتم بـــــە مـــــەنزلی دلـــــدار[4]

---

(١) زەرەر: زیان، سەمەر: بەرهەم
واتە بێجگە لە زەرەر و زیان درەختی بێگانە مەبەستی خزمەت کردنی خەڵکی بێگانە هیچ سوود و بەرهەمێکی نیە، خۆش و لەزەتیش لەوەدا بەدی ناکرێت کاتێك درەختێك بەری هەبێت و لە بەرزاییدا بێت و خەڵك بە دار و بەرد ئەو بەرهەمە لێ بکاتەوە.
شاعیر لێرەدا فەلسەفەیەکی قولی بەکار هێناوە هەرکاتێك کەسێکی دوژمن و ناحەز بە میللەتەکەی بیکات، دواجار بە بەراورد ریسوا دەبێت ئەو کاتەش ژیان تامێکی نابێت.
(٢) کاڵ: خاو نەگەییو، تەحەمول: ئارام
واتە: ئەو دڵەی من وەکو دارێکی بەردار وایە، بەڵام بەرهەمی هێشتا پێنەگەیشتووە و کاڵە بەڵام ئەگەر خوا حەز بکات سەبر و قەرار و ئارامم پێ ببەخشێت هەتا بەرهەمەکە پێدەگات.
(٣) سەفا: پاك و بێگەرد، سەعی: هەوڵدان، نیگار: خۆشەویست دلبەری جوان.
واتە بە داغ و حەسرەتێکی زۆرەوە دەچمە کۆڕی ماتەم گێڕانەوە، کەچی پاش ئەو هەوڵ و ماندوبوونەم لەلایەنە دولبەری شۆخ و شەنگەوە هیچ پاك و بێگەردییەکی لێ نەدیت.
(٤) واتە هەر لەو رۆژەی خوای گەورە ئەرواحەکانی دروست کرد و کۆیکردنەوە پێی فەرموون ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ﴾ هەتا ئێستا من لەسەفەردام و دەگەڕێم بۆ ئەوەی بگەم بە کاروانی دڵداران، بەڵامە بە داخەوە هێشتا پێیان نەگەیشتووم.

فیدای زیندە دلانی تەریقەت خوبانم
هەمیشە تازە دەبن هەمیشە بەهارە[١]
لەچەشمەی ساری کەی مەعاریف نسیب ئەبێ؟
هەمیشە چاو تەڕ و زار و وشک و بۆ بەیار[٢]
(حەریقی) ئەگەر غەمی شێخ عومری سووتاند
کەبابی سینە بە ناپوختە هاتە مەجلیسی یار[٣]

---

(١) فیدا: قوربانی، زیندە: دڵی بێ ئاگا وریا، خوبان: جوان شۆخ.
واتە من بە قوربانی تەریقەتی ئەو کەسە شۆخ و شەنگانەم کە هەردەم دڵییان بە ئاگا و ورپاییە، ئەو دلانە کە هەردەم تازەن و نوێ دەبنەوە وەکو گوڵی بەهار کە تازە خونچە دەکەن و گەش دەبنەوە.
(٢) چەشمە: کانی، ساری: ئیش کردن لە شتێك کە بە هەموو لایەك بڵاوببێتەوە.
واتە لە سەرچاوەی زانستەوە کە زانست دەگوازرێتەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکەی کەی و چ کاتێك ئەو زانستە بە نسیبت دەبێت. کە هەمیشە و هەردەم ئەوەی داوای زانست دەکات چاو بە فرمێسکەوە زمانی وشکە و لێو بە بارە.
(٣) ئاگری خەم و خەفەت هەموو عومری حەریقی سوتاند و بەبایدا بۆیە بە سینە سووتاوی هەروەکو کەباب زۆر بە نارێکی هاتە کۆڕی دڵداران.

# پیتی سین

حوزنی من و حوسنی تۆ ئەشکالە تا ئاخر نەفەس
بۆ چ زەکاتی حوسنی تۆ یا حوزنی من ناگا بە کەس [1]

زاهرەن فەرمووتە وەختی مردن حازر دەبم
وا لە خۆشی مردنم دەمرم! دەسا ئینسافە بەس [2]

چۆن ئەکەی مەنعی دڵی من تۆ لە شەهدی لێوی خۆت
لێوی تۆ وەک شەکرستان و دڵی من وەکی مەگەس [3]

---

(١) حوزن: ناخۆشی، حوسن: جوانی.
ناخۆشی و غەم و خەفەتی من و جوانی و رێك و پێکی تۆ گرفتی پەیدا کردووە و بۆتە جێگای گومان تاکو کۆتایی ژیان، بەڵام لێرەدا پرسیار ئەوەیە ئەو غەم و ناخۆشییەی من و جوانییەی تۆ بۆ چ زەکاتی لێ نادرێت و ئەو زەکاتەش ناگات بە هیچ کەس، چونکە دەبێت بدرێتە کەسانی هەژار و کەم دەرامەت.

(٢) زاهرەن: بە ئاشکرا، حازر دەبم: ئامادە دەبم.
واتە بە ئاشکرا بە راستی پەیمانت داوە گوتووتە هەر کاتێك کاتی مردنت هات ئەوا لەسەر گیان کێشانت ئامادە دەبم، منیش لە خۆشی ئەو پەیمانەی کە داوتە کە مردنم خەریکە لە خۆشی مردم وا دەمرم، دەی مادام وایە تۆزێك وەفا ئینسافت هەبێت.

(٣) مەنع: قەدەغە، شەهد: هەنگوین.
واتە چۆن بە چ شێوەیەك هەوڵی ئەوە دەدەی کە قەدەغەی دڵی من بە خۆت بکەی لە کاتێکدا ئەو قسانەی لە لێوان دێتە دەرەوە هێندە شیرینە هەر دەڵێی هەنگوینە، هەروەها لێوی تۆ هەروەکو شەکرستانە واتە قسەکانت هێندە خۆشە هەروەکو شەکر، دڵی منیش هەروەکو مێش و مەگەز وایە کە عەشقی شیرینە دەست بەرداری نابێت.

چـاوەكەم لـەو بـاغی حوسـنە مـەنعی چـاوی مـن مەكـە
لازمـە بـۆ پاسـەوانی باغەكـەت جـوتی عەسـعەس[1]
تـازە فەرمووتـە لـەلای كـەس رازی عەشـقی مـن مـەلی
نەت ئەزانی دڵ كە كون بـوو دەنگـی لـێ دی وەك جـەرەس[2]
پێـی بڵـێن زاهـد بـەخێری خـوی لـە وەعـزی مـن گـەری
عەشقی من شوعلە و بڵێسەیە وەعزی ئەو وەكو خار و خەس[3]
خـاڵی سـەوزە داغـی سـەوزە باسـی ناسـوری مەكـەن
تـا زەدی ئـەو بـی (حـەریقی) قـەت شـفای نـابی بەكـەس[4]

---

(١) حوسن: جوان، لازمە: پێویستە، عەسعەس: پاسەوانی شەو.
واتە چاوەكەم لە باغی جوانیت كە تۆ هەتە، تۆش قەدەغەی چاوی من مەكە لە بینینی ئەو باغی جوانیەت، پێویستە بۆ پاسەوانی باغەكەت پێویست بە دوو پاسەوانی شەو هەیە.
(٢) جەرەس: زەنگ.
واتە تازە خۆت فەرمووت رازی عەشقی من لەلای هیچ كەسێك باسی نەكەم، ئایا ئـەوەت نەزانیووە هەر كاتێك دڵ كە كون بوو ئیتر ئەو كون بوونە دەنگ دەداتەوە هـەروەكو زەنـگ كە هەموو كەس گوێی لێ دەبێت.
(٣) زاهد: خوا پەرست، شوعلە: گڕی ئاگر: بڵێسە: گڵپە.
واتە بڵێن بە ئەو خوا پەرستە بە بەخێری خۆی دەست هـەڵبگرێ لـە حـاڵ و بـاری مـن، چونكە عەشقی من وەكو گڵپەی ئاگر جۆشی سـەندووە وا بەئاسـانی ناكوژێتـەوە، حـال و باری ئەویش وەكو درك و داڵ وایە بە ئاسانی ئاگری من دەیگاتێ و بە ئاسانی دەسووتێت.
(٤) ناسور: دەرد و بەڵا، زدە: بریندار.
واتە باسی دەرد و بەڵا و ناسۆری مەكـە چونكە خـاڵ و داغـی سـەوز و پیرۆزییـە، كەواتـە باسی برینداری (حەریقی) مەكە هەرگیز چونكە بـە دەسـتی ئـەوەوە بریندارم، جا كەواتـە هەر دەبێت ئەو سارێژی برینم بكات، چونكە شیفای من بەدەستی هـیچ كەسێك نایـەت بـە دەستی ئەو نەبێت.

# پیتی شین

عالەمێکــــە پــــر شــــەر و شــــۆر نیــــزاع و ئیرتهــــاش
ڕۆژگارێکــــە سەراســــەر میحنــــەت و پــــڕ ئیفتشــــاس[1]
کــەس نییــە بــۆ ئیســتراحەت ســەر بنێتــە ســەر ســەرین
کــەس نییــە ئاســوودە بــی پــالووی لــە خــاری ئــیفتراش[2]
تــالبی ئیمســاکی دەرخســت روو بــەروو هاتۆتــە پــێش
ســاحیبی عرفــان و دانــش ســەر بــە زان و چــووەتە پــاش[3]
بــــۆ ســــلوکی ڕێــــی مــــەعاریف پاڵــــەوانیش ناتــــەوان
بــۆ تــەریقی جــەزب حەیفــە وەك یەكــە دەرد و هــەراش[4]

---

(١) نیـزاع: دووبـەرەکی، ئیرتهـاش: فـرت و فـێڵ، میحنـەت: ئـێش و ئـازار، ئیفتشـاش: غـەل و غەش.
واتە ئەمڕۆلە دونیایەك دەژین پڕ بووە لـە شـەڕ و شـۆڕ و دووبـەرەکی دەسـت بـڕین فـرت و فێڵ، ڕۆژگارێکە سەراسەر پڕ بووە لە کارەسات و غەل و غەش.
(٢) ئیستراحەت: پشوودان، سەرین: بالیف، پالوو: پەراسوو، ئیفراش: جێگای نوستن.
واتە لەو سەردەمەی تێدا دەژین هیچ کەس نییە شەو بە ئیسراحەتی خۆی بۆ نووستن سەر بنێتە سەر بالیف و خەوی لێ بکەوێت، هەمدیسـان کـەس نیـە پەراسـووی خـۆی کەلەکـەی خۆی بە ئیسراحەت بخاتە سەر جێگای نووستن.
(٣) ئیسماك: خۆ دوور خستنەوە لە شت و خـواردن، عرفـان: خوانـاس، دانـش: زانسـت، زانـو: ئەژنۆ.
جاران هەردەم داوای خۆ دوورخستنەوەی دەکرد خـۆی دەشـاردەوە، بـەڵام ئێسـتا هاتۆتـە مەیدان و ڕووبەڕوو خۆی دەرخستووە هاتۆتە پێش، خـاوەنی خوانـاس و زانسـت و زانیـاری لەسەر ئەژنۆ و دەگەڕێتەوە دواوە کەسێك ئەهلی تـەقوا و خواناسـین بێـت خـەڵکی پشـتا و پشت دەگەڕێتەوە دواوە ئەوەش وەکو ڕێزنان.
(٤) سلوك: ڕێگەی هەق و پلە و پایـەی گەیشـتن بـە خواپەرسـتی، مـەعاریف: زانیـاری جـەزب: ڕاکێشان.

نـــان و ئـــاوی ئـــەهلی دڵ عوســـەیە و خـــوتبی جگـــەر
دەســـتی بـــەرداوە لـــە عـــەرزە تـــالبی نـــانی بـــەلاش[١]

هەرکەســـــی دانگـــــی شـــــعوری شـــــیعرێکی هەیـــــە
ئەبلەیی دەنگ بۆتە ساحیب مـولکی شـەش دانـگ مـەعاش[٢]

گـــەر بـــە نـــیلا و زۆر نـــەبێ رۆژی وەدەس کـــەس ناکـــەوێ
شـاهیدە بـۆ مـودەعی راسـتی حـوکمی قـازی کـیری جـاش[٣]

دیـــن بـــەزایع گـــەر بـــۆی رێـــک بکـــەوێ پیـــاوی ناگـــەهات
وەک کـــەلیم اللە خـــوا کردیـــە دەلیلـــی ســـەنگ تـــەراش[٤]

---

واتـە بـۆ گەیشـتن بـە رێگـای هـەق و خواپەرسـتی پێویسـتی بـە زانیـاری هەیـە، ئەگـەر نـا پاڵەوانیش بێت هەر ناتەواوە، جا بۆ رێگای راکێشانی خەڵك بۆ ئەو رێگایە جێگای داخە کە هەموو بەیەك چاو تەماشا بکەی چونکە ئینسانی دەردەدار و نەخۆش وەکو یەك نین.

(١) غوسە: غەم و خەفەت، عورزە: لێهاتوویی.

واتە خۆراکی ئەو کەسانەی کە دڵیان رۆشن بوویەتەوە بە خواپەرستی هەر غەم و خەفەتە و خۆراکیان بۆتە خوێنی جگەر و خوێنی خۆیان دەخۆنەوە دەستیان لە هەموو شتێك و دنیا پەرستی بەرداوە، پێچەوانەی ئەو کەسانەی کە هـەردەم خوازیـاری نـانی بەلاشـن چـاو لـە دەستی خەڵکن.

(٢) دانکی: توزێك، هەندێك، شعور: هەست: هۆش، ئەبلە: کەم عەقل و بێ هۆش.

واتـە: هـەر کەسـێك هەنـدێك هەسـت و هۆشـی هـەبێت ئـەوە خـاوەنی داهێنـان و دانـراوی خۆیەتی خاوەنی بیروڕای خۆیە، بەڵام ئەمڕۆ کەسانی بێ هۆش و کەم عـەقڵیش لـە سـایەی هەندێك مووچە بونەتە خاوەن پارە وەکو پاشایان لێهاتووە.

(٣) نیلاو: ماستاو سارکردنەوە و خۆ رەپـێش کـردن نـەبێت رزق و رۆزی دەسـت هـیچ کەسـێك ناکەوێت بەڵگەش ئەوەیە کاتێك داواکـار دەچـێت داوای مـافی خـۆی دەکـات لای قـازی ئـەو مافەی پێشێل دەکرێت چونکە مرۆڤێکی راستە و نازانێت ماستاو بـۆ قـازی سـارد بکاتـەوە ئەویش لەوەڵامدا پێی دەڵێت مافەکەت بە کیری جاش واتە نیە مافت.

(٤) زایع: بەفیڕۆ چـوون، ناگـەهان: بـێ ئاگـا، کـەلیم اللە: نازنـاوی حـەزرەتی موسـایە سـەلامی خوای لێ بێت، کە لە کێوی تور قسەی لەگەڵ خوای گەورە کـردووە هـەروەکو لـە قورئانـدا باس کراوە ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا﴾، سەنگ: قورسایی.

نــــەك وەكـــو قـــازی زەرور و وەك مــــەلای نەخوێنــــدەوار
یـــا خەلیفـــەی كولـــەتاش و مورشـــیدی جـــوهر تـــەراش[١]
بـا وەكــو مــن بــەخت و تــالع، بــاوەر و و یــارم نــەبوو
جیــی موتــالا و نــۆرە دەرســم بووەتــە دەوری نوبــە ئــاش[٢]
وەك ئەرســــتۆم جهـــانگیرم، ســــكەندەر بــــی نییـــــە
جـــاری (بابـــا) رەفـــیقم بـــی وەكـــو یولداشـــی بـــاش[٣]

---

واتە پیاوی نەزان و بێ ئاگا گەر بۆی رێك بكەوێ دین بە فیرۆ دەبات و لەناوی دەبا، هەروەكو حەزرەتی موسا كە نازناوی كەلیم الله كاتێك ویستی قسە لەگەڵ خوا بكات تەنها خوای گەورە نوری خۆی پیشان دا لە هۆش خۆی چوو.

(١) مورشید: رێنماكەر ئەو كەسەی رێنمایی خەڵك دەكات بۆ گرتنەبەری ئاین بۆ كەسێك دەگوترێت كە رێگای سوفیزمی گرتبێتە بەر، جەوهەر: شتێكی مەعنەوییە بۆ كەسێك دەگوترێ كە بێ وێنە بێ لە ئازایەتی و پیاوەتیدا، خەلیفە: جێنشین پلەیەكی رێگای سوفیزمە بە واتای جێنشینی شێخ.

واتە نەك وەك قازیەك بە خۆرایی ببێتە قازی و یاخود وەكو مەلایەكی نەخوێندەوار یا وەكو خەلیفەیەكی ئاوارە و دەربەدەر یاخود وەكو مورشیدێكی كە هەرچی جەوهەرە نیەتی.

(٢) تالع: بەخت، موتالا: خوێندنەوە جێگای دەرس گوتنەوە.

واتە پەیوەندی بە درێژی پێشوو هەیە یا وەكو كەسێكی وەك من بێ بەخت و شەنس كە یار و یاوەرم نییە كە جێگای خوێندوە و وان گوتنەوەم نیە واتە شوێنی وانە گوتنەوەم نەبێت كە حوجرەیە (دەبێت ئەو كاتە (حەریق) مزگەوتی نەبووە كە وانەی تێدا بڵێتەوە) هەروەكو نورە گرتنی خەڵك كە دەچنە ئاش بۆ لێكردنی باراش.

(٣) ئەرستۆ: فەیلەسوفێكی یۆنانی و مامۆستای ئەسكەندەر بووە، ئەسكەندەری مەقدۆنی كوڕی فلیپ لە ساڵی ٣٣٦ پ. ز هاتە سەر تەختی پاشایەتی، ساڵی ٣٢٣ پ. ز كۆچیی دوایی كردووە لە ساڵی ٣٣٤ پ. ز لە سوپایەكی ٤٠ هەزار كەسی بە مەبەستی داگیركردنی ئێران هات لە نزیك هەولێر لەگەڵ داریۆش كەوتە جەنگەوە و توانی سەركەوێ و ئێران داگیر بكات.

واتە وەكو ئەرستۆ حەكیم و زانا و دانام، هەروەكو ئەسكندەریش توانای داگیركردنی دینام هەیە هەندێك جاریش هاوڕێیەتی پاپا دەكەم و وەكو برادەرێكی باش.

# پیتی میم

هـەموو کـەس بـا بزانـێ مـن کـە سـەودای زولفـی دووتـاتم
لە خانەی گوڵم دا کـوڵم بـە فـەرزی شـای و روخـت مـاتم[١]
ئەگەر چی ساکنی مـولکی عەجـەم بـووم دور لـە روم کـەوتم
لـــە ســـایەی پەرچـــەمی تـــۆوە رەئیســـی مـــوڵکی شـــاماتم[٢]
دڵـم هــەروەك رەعییــەت خــۆش نشـینی مـوڵکی ئەعزانــە
لـــە هـــەرجێ دائەنیشـــی لێـــی گـــەڕێ قوربـــانی بـــالاتم[٣]

---

(١) سەودا: عەشق، کۆلم: شان، کۆلم: بێ زەین وەکو دەڵێن بیر کۆڵ، روخت: دەم و چاو و روومەت، مات: کزم.
واتە هەموو کەس با ئەوە بزانێت کە من عەشقی زوڵفتم و لە هیچ کەسیش ناشارمەوە ئەوەتا لە خانەی ئەوەی کە کەوتۆتە سەرشانم من زۆر بێ زەینم، بێ هۆشم بە شادی و خۆشی رازاندنەوەی روت گەلێك کز و ماتم.
لە نێوان کۆڵم و کۆڵم رەگەزی دۆزی تەواو هەیە.
(٢) ساکن: نیشتەجێ، عەجەم: وڵاتی فارس، رۆم: وڵاتی تورك.
واتەمن بەهۆی تۆوە ئێستا نیشتەجێی وڵاتی فارسم و هەر کاتێك لێم دووربی وا هەست دەکەم دەکەومە وڵاتی رۆم، بەڵام بەهۆی جوانی و عەشقی پەرچەمی تۆ ئێستا سەرۆکی هەموو موڵکی وڵاتی شامم.
(٣) رەعییەت: هاوڵاتی دەست و پێوەند، ئەعزا: ئەندام
دڵم هەروەکو هاوڵاتیەك چۆن لە وڵاتی خۆی نیشتەجێ دەبێ دڵی ئارامە منیش هەر کاتێك لە ناو ئەندامەکانی خۆم شوێنم دەبێتەوە ئەوا دڵم ئارام دەبێت جا ئەو دڵەی لە هەر شوێنێکی ئەندامەکانی تۆدا نیشتەجێ دەبێت وازی لێ بهێنە و لێی گەڕێ با بە قوربانی باڵات بم.

موتالای حاشییەی زوڵفی سەری سەفحەی روخی سەعیە
لە بۆم چابوو بە منداڵی لە دەرسی عەشقا راهاتم[١]
ئەگەر راستت ئەوێ سەروی بلند بالا! درۆ ناکەم
لە پاش فەوتی حەیاتیشم بە ئومیدی مولاقاتم[٢]
نەوای ناڵەی حەزینم راستە وەك قافیلە حیجازی دێ
وەرە سەر سەیری بەزم و سۆزش و شوری مقاماتم[٣]

---

(١) موتالا: خوێندنەوە، حاشیە: رۆخی کتێب، یاخود شەرحی مەتن کە جاران لە کتێبە ئاینیەکان دروست دەکرا، سەفحە: لاپەڕە، سەعب: زەحمەت.
واتە: موتالاّ کردن و خوێندنەوەی حاشیەی زوڵفت لەسەر لاپەڕەکانی رووت کارێکی زەحمەتە، بەلاّم با شیەکەم لەوەدا بوو هەر لە منداڵی راهاتبووم لەسەر عەشقی تۆدا بۆیە لام ئاسانە ئێستا.
(٢) سەروی بڵند: دەرختێکی بەرزە، فەوت: مردن، ملاقات: بەیەك گەیشتن.
واتە ئەگەر راستت دەوێت ئەتۆ بەژن و بالاّت هەروەکو درەختی سەرو وایە کە هێندە بەرز و رێك و پێکە واتە بالاّ بەرزی ئەوە راستە و درۆی تێدا نیە، هەر بۆیە لە پاش مردنیشم کە لە ژیان دەردەچم هەر بەو ئومێدە دەژیم و دەمرم کە پاش مردنیش لەو دنیا پێت بگەم و بە دیداری بالاّت شاد بم.
(٣) نەوا: ئاواز، حەزین: غەمبار، قافلە: کاروان، سوز: سوتان، شور: خوێ، مقامات: کۆڕ و مەجلیس.
واتە: ناڵە و ئاوازی غەمباراویم وەها دەنگی دێت هەروەکو کاروانی رێگای حیجاز وایە، جا وەرە تۆ سەیری سوتانم بکە و پاشان بە چاوی خۆت ببینە ئەو فرمێسکەی وەکو خوێواك سوێرە کاتێك لە چاوم دێت کە لە کۆڕ و مەجلیسەکاندا دادەنیشم.

دەڵـێن فەرمووتـە یـار بێتـە موتـالای خـەتی رەیحـانی
بڵـێن بـا شـەمعی روخسـاری بـالاّ لێـی سـێنی وا هـاتم[1]
بـە شـیرنی مـەزەی لێـو خـەتی سـەبزت دڵـم خۆشـە
لە مەیخانـەی غـەمی عیشـقت کـەوا سەرمەسـتی سـەهباتم[2]
بە یـادی مەدرەسـەی عیشـقت گـەلی عـیلمم کەسـب کـردن
ئەمیسـتا کـە لەبـەر چـاوت شـەراب خـۆری خرابـاتم[3]

---

(١) خەتی رەیحانی: مووی تازە هاتوو لە روومەتی شۆخ و شەنگان، شەمع: مۆم.
واتە دەڵێن گوتوتە با یار با بێتە تەماشا و مرتالاکردنی و خوێندنەوەی ئەو مووە تازە هاتوانەی کە لە روخساری شۆخ و شەنگی وەکو تۆ هەیە چونکە روخساری رووی تۆ هەروەکو مۆم وایە دەدرەوشێتەوە لە تاریکایدا و بەلای لێ دوور دەکەوێتەوە وا هاتم.
مەزە: ئەوشتە لەگەڵ عارەف دەخورێتەوە، خەتی سەبز= مووی دەم و چاو، مەیخانە= شوێنی عارەق خواردنەوە.
(٢) ئەو کاتەی قسە لە لێوەکانت دێتە دەرەوە کە هێندە شیرینە و دەڵێی شەکرە لەگەل ئەو موانەی کە تازە لە دەم و چاو و روخسارت هەیە هێندە دڵم خۆشە بۆیە کاتێك لە غەمی عیشقت دا دەژیم هەروەکو ئەوەیە لە مەیخانە دانیشم و مەست بم بەو جامە شەرابەی کە دەیخۆمەوە.
(٣) کەسب کردن: بەدەست هێنان، خرابات: کەلاوە: مەیخانە.
واتە تۆ وەکو قوتابخانەیەك وابوی بۆ من جا لەو قوتابخانە عیشقەی تۆ گەلێك زانست و زانیاری فێر بوون و گەلێك شتیشم بە
دەست هێنا، وا ئێستاش کە دەمبینی و لەبەر چاوتم بوومەتە شەراب خۆر و لە مەیخانەی تۆدا.
شاعیر مەبەستی ئەوەیە کە پێمان بڵێ لە رێگەی ئیرشاد و سلوکی تەریقەتەوە گەلێك لە نهێنییەکانی ژیان فێربوومە ئێستا هەردەم لە گۆشەی خانەقای تۆدا کەوتوم بۆ ئەوەی زیاتر بە هرەمەند بم.

قرانــی عاشــقانە کــەس نــەما دەرچــێت و ســەر دەرکــا
مەگــەر بــۆ موفلیســی وەك مــن بــێ قــران و بــەناباتم[1]
کــەوا پارچــە غــەزەل دەبــڕێ (حــەریق) ئــەمرۆ لــە دیوانــت
ئــەلی هــەر چــاوەڕێی دەســتە خەیانــەی زولفــی تاتــاتم[2]
ئــەی خضــری رێــی زولمــەت ســەری ئــاوی حــەیاتم
بــێ شەمســـی روخــت ســاکینی قــەعری زولومــاتم[3]

---

(١) قران: نەمان، موفلیس: بێ پارە و سامان، قران: جۆرێکە لە پارە ناوی پارەیە.
واتە عاشقان و خۆشەویستان هەموویان فەوتان و کەسیان نەما کە دەرچێتو سەری خۆی دەربهێنێ، مەگەر کەسێکی بێ پارە و پولی وەکو من کە هیچ پارە و پولی نەبێ لە پەنای تۆوە خۆی حەشار بدات یاخود خۆی بهاوێتە پەنای تۆ، لە نێوان قرانی یەکەم و دووەمدا جیناسی تەواو هەیە.

(٢) زولفی دوتا: زولفی لول
واتە ئەمڕۆ من (حەریق) خەریکی ئەوەم لە پارچە غەزەل دەبڕم لە دیوانت وەکو ئەو کەسە وام کە هەردەم چاوەڕێی دەستە و تاقمی خۆی ببێت منیش چاوەڕێی بینینی زولفی خاو لولدراوی تۆم، دەکرێت بڵێین (دیوانت) مەبەستی شوێنی خانەقا بووە و ئەویش خەریکی وەرگرتنی سلوك بووە بۆیە هەردەم چاوەڕێی ئەوە بووە کە شتی تازەتر فێر ببێت.

(٣) خضر: خدری زیندە، زولمت: تاریکی، قەعر: لەبن لە ژێر.
واتە ئەی خدری زیندە کە تۆ ئاوی حەیاتت خواردۆتەوە و هەرگیز نامری، من رێگای تاریکیم گرتۆتە بەر و سەرم لێ شێواوە و رێگام لێ ون بووە لە تاریکایدا دەی تۆش بە هانام وەرەوە و رێگای راستم پیشان بدە، چونکە رووی گەشی تۆ وەکو رۆژ وایە رێگام بۆ رووناك دەکاتەوە کەوا ئێستا من نیشتەجێی ژێر ژێرەوەی تاریکستانم.

ئەفسوودەیی سەرمایی حوزوور و شەهەواتم
رەنجیدە و ئازارەزووی دەستی خەراباتم(١)
دڵ بۆتە پیادەی جلەوی ئەسپی هەناسەم
بۆ دەوری روخی شاهی جیهان بەیدەقی ماتم(٢)
هەرچەندە کە هەڵاتم وەکو بوم شومی وڵاتم
هەر چاوەڕوانی کەرەمی پیری هیراتم(٣)
گەرچی وەکو سەر دەفتەر و سالاری عوساتم
لەم خاکی دەری رەحمەتە مامولە نەجاتم(٤)

---

(١) ئەفسودە: غەمگین، شەهەوات: لەزەت، رەنجیدە: دڵگران، ئازاردە: ئازار دراو.
واتە من ئێستا خەمبار و غەمگین و ژێردەستەیی بەندەی ئارەزوو و لەزەتی خۆمم هەر بۆیە بوومەتە کەسێکی رەنجا و ئازار دراوم کەوتوومەتە کاولگە بێ ئەوەی کەسێك بەلامەوە بێت.

(٢) جلەوی ئەسپ: ئەو قایشەیە سەرێکی بە دەمی وڵاغەکەوەیە سەرەکی دیکەی بە دەستی کەسە سوار بووەکەیە، بەیدەق: رێگا پیشاندەر.
واتە من ئێستا بوومەتە پیادە جلەوی من بەدەست هەناسەمەوەیە واتە دەسەڵاتم لە دەست خۆمەوە نیەوە نازانم بۆ کوێ دەچم، ئەگەر رووی جوانی شاهی جیهان ببێتە رێگا نیشاندەرم ئەگینا من کەسێکی مات و سەرگەردانم.

(٣) بوم : کوندەپەپوو، شوم: نگبەت، کەرەم: خێر و بەرەکەت، پیر: شێخی تەریقەت یان مورشید، هیرات: ناوی شوێنێکە لە ئێران.
واتە ئەگەرچی من کۆچم کرد و هەڵاتم بەڵام وەکو کوندەپەپوو مایەی نەگبەتیم جێگا و رێگام کاولگەیە، بەڵام سەرەرای هەموو ئەوانەش نائومێد نیم و چاوەڕوانی خێر و بەرەکەتی چاك و پیری شاری هیراتم بەڵکو بە هانامەوە بێت و رزگارم بکات لەو نەهامەتییە و نەگبەتییە.

(٤) سالار: پێشەوا سەرکردە، عوسات: چەتە و رێگر، مامولە: ئاواتەخواز، نەجات: رزگارکردن.
واتە ئەگەرچی من ئێستا سەرکردە و سوپاسالاری چەتە و رێگر و گوناهکارانم کەواتە لەو

قوربـــانی ســـەگت بم شـــاهی مەیـــدانی هیدایـــەت
وەك ســـالیکی بـــێ مەســـلەك رێـــی هـــات و نـــەهاتم[١]

زەنگـــی خەتـــەرە و وەسوەســـە و واقـــەلبی قـــەلب کـــرد
هـــەر مونتـــەزری گوشـــەی میرئـــاتی جـــەلاتم[٢]

حـــەیران و سەراســـیمە وەکـــو بولبـــولی بـــێ گـــوڵ
ئاشـــقتە و گـــیرودەی خـــالی گۆنـــاتم[٣]

تـــەعمیری دڵـــی بـــاغی لـــە بـــاغ چـــاترە قوربـــان
لـــەم چـــاوە منـــیش موتـــەزری مـــائی افـــوراتم[٤]

---

کات و ساتە و دەورەوبە ئاواتەخواز و مەبەستمە بەر رەحمەت بکەوم و رزگارم بێت.

(١) شاهـ: گەورە، سالیك: رێگا مەبەست رێگای ئاین، بێ مەسلەك: بێ رێگا نیشاندەری واتە بێ مورشید.

واتە ئەی ئەو کەسەی کە رێگا خۆشکەری بۆ ئەوەی خەڵکی بهێنیە سەر رێگای راست با بەقوربانی سەگی بەردەرگات بم کە پاسەوانیت دەکات چاوی رەحمەتت لێم بێت چونکە من بەبێ رێگانیشاندەر رێگام گرتۆتە بەر کە رێگای هات و نەهاتە.

(٢)قەلب: دل، قەلب: سەراو بن، مونتەزیر: چاوەڕوانی، میرئات: ئاوێنە، جەلا: روون و ئاشکرا.

واتە زەنگی مەترسی و وەسوەسەی بەردەوام دڵ و دەروونی سەراوبن کردوومە، بۆیە منیش چاوەڕوانی ئەوەم لە گۆشەی نیگای روون و ئاشکرای تۆوە کە وەکو ئاوێنە وایە بە هانامەوە بێت، لە نێوان قەلب و قەلب جیناسی تەواو هەیە.

(٣) حەیران و سەراسیمە: سەرگەردان، ئاشقتە: پەرێشان، گونا: کولم

واتە حەیران و سەرگەردانم هەروەکو چۆن بولبول کاتێك لە گوڵ دادەبڕێت سەرگەردان دەبێت منیش بولبوڵ ئاسا ئاوها سەرگەردانم بەڵام من پەرۆشی و گیرۆدەیی ئەو خاڵەم کە لەسەر گۆنات هەیە.

(٤) تەعمیر: چاککردنەوە، یاغی: یاخی، مائی فورات: رووباری فورات.

واتە چاککردنەوەی دڵی کەسێکی یاخی بوو گەلێك چاکترە لە چاکردنی باغێك قوربان چونکە ئەو دڵەی یاخی بێت دەست دەکات بە کاری خراپە و گوناە، جا بۆ ئەوەی تووشی ئەو گوناهە نەبین با دەست بە چاککردنی بکەین، منیش هەر چاوەڕوانی ئەوەم بە ئاوی

تـــا مەتلـــەعی کەنعانیـــــە نیـــو چـــاه زەمـــیرم
ســـەنگین بـــە ســـەعادەت بـــۆ تـــەرازوی نیشـــانم[1]

بـــۆ دیـــدەی یعقـــوب خـــرد یـــەك نـــەزەری تـــۆ
خاســـــیەت پیراهـــــەنی کردۆتـــــە خـــــەلاتم[2]

زانیومـــە کـــە ســـوئی ئەدەبـــە شـــەکوای ئـــەحوال
چ بکـــەم دەســـەلاتم نیـــە بـــێ ســـەبر و ســـەباتم[3]

تـــۆ شـــەمس و منـــیش زەررەی بـــێ جلـــوە بـــە قوربـــان
نیســـبەت هەیـــە عـــەیبی چـــییە جوبـــایی بـــەراتم[4]

---

رووباری فورات ئەم دڵەم بشۆریتەوە.

(١) مەتلـەع: شـوێنی هـەڵاتن، کـەنعان: دەشـتی کـەنعان شـوێنی نیشـتەجێبوونی حـەزرەتی یەعقوب، چاه: پیر. خرد: ورد، سەنگین گران، سەعادەت: بەختیاری.

واتە لە شوێنی هەڵهاتنی مانگی کەنعان مەبەست لەدایکبوونی حەزرەتی یوسف هـەتا ڕۆژی فرێدانی بۆ ناوبیر، ئەوە نیشانەی سەنگینی و بە بەختیاری ژیانە.

(٢) پیراهەن: کراس، دیدە: دیتن، خرد: ورد، نەزەر: تەماشا کردن.

واتە یەك تەماشاکردنی تۆ بەسە بۆ چاو ڕۆشنایی چاوی حەزرەتی یـەعقوب کـە کراسـەکەی یوسفیان بەسەر چاویدا هێنا ڕوناکی بۆ چاوی گەڕایەوە ﴿ٱذْهَبُوا۟ بِقَمِيصِى هَـٰذَا فَأَلْقُوهُ عَلَىٰ وَجْهِ أَبِى يَأْتِ بَصِيرًا وَأْتُونِى بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ﴾ (یوسف: ٩٣).

(٣) سوئی ئەدەب: بێ ئەدەبی، شەکواه: شکایەت، سەبر و سەبات: بێ ئارامی.

واتە زانیومـە شـکایەتی کردنـی لـە بـار و زروف دەبێتـە بـێ ئـەدەبی، بـەڵام چ بکـەم هـیچ دەسەڵاتم نیە چونکە هیچ ئۆقرە و ئارام و سوکناتیم نەماوە.

(٤) شەمس: ڕۆژ، زەررە: گرفتار، جلیوە: دەرەوشانەوەی نوری خوا لەناو دڵی کەسی خوانـاس، نیسبەت: پەیوەنـدی نێـوان دو شـتی بەیـەك چـوو، جوبـایی: ڕزگـار بـوون، بـەرات: شـەوی نیوەی مانگی شەعبان.

واتە تۆ وەکو ڕۆژ دەدرەوشێیتەوە و منیش گرفتاری ئـەوەم کـە نـوری خـوا لـە دڵمـا نییـە لەلای ئەهلی سوفیزم تیشکی ڕۆژ زانست و بەرەکەتی مورشیدە بۆ ناو دل و دەروونی سۆفی ئەو بەیەك چوونە چ عەیبێکی هەیە گەر بێت و لەو بێ درەوشاوەییە ڕزگارم بێت.

بـــا وەســـفی هـــەموو زیللـــەت و ئـــەحوالی رەزیلـــیم
چـــون مـــونکری تـــو نـــیم و ەکـــو ســـولتانی وولاتم[1]
بـــــەم تەلەبـــــەی عـــــەتتاری خەیالاتـــــە حـــــەریقی
هـــەر بـــانگ کـــە وەرە موشـــتەری بـــۆ شـــەهدی نـــەباتم[2]
بـــەز اهـــر گـــەر لـــە ئەســـبابی ســـرور و ســـروری تـــۆ دوورم
بـــە شـــوکری نیعمـــەتی وەســـلت لـــە شـــادیدام و مەســـرورم[3]
لە بوك و پێخەسوو بەربووك و پوپ چەرمك نـەبووم ئـەمما
دوعـــا گـــوی دەلیلـــە ئەلبەتـــە لـــەو زەمرەیـــە مەحشـــورم[4]

---

(١) رەزیل: ناکەس، مونکیر: بێ باوەڕ
واتە هەموو وەسفی زیلەت و کاروباری ناکەسیم بۆت بکەم من چۆن باوەڕ و ئومێدم بەتۆ نییە، کە ئێستا لە سایەی باوەڕ بەتۆوە ئێستا بوومەتە سوڵتان و گەورەی وڵات.
(٢) تەلەب: داواکار، عەتار: دوکاندار، موشتەری: کڕیار، شەهد: هەنگوین، نەجات: گژوگیا لە زەوی دەروێ.
واتە حەریقی ئەو داواکارییەی کابرای شت فرۆش دەیکات هەموو خەیاڵاتە کە بانگی کڕیار دەکات و دەڵێت وەرە هەنگوینی گژوگیام لێ بکڕە کە هەنگوینی گژوگیا سافە و بێ غەلە و غەشە یاخود هەنگ شیلەی گژوگیای هەڵمژیوە.
(٣) زاهیر: ئاشکرا، ئەسباب: هۆکار، سرور: کەیفی خۆشی، وەسل: بەیەك گەیشتن.
واتە بە ئاشکرا ئەوەی دەبینرێ ئەوەیە کە لە هۆکارەکانی شادی و کەیف خۆشی تۆ گەلێك دوورم، بەڵام سوپاسگوزاری خوا دەکەم لەسەر ئەو نیعمەتەی کە پێت گەیشتم بۆیە ئێستا گەلێك شاد و دڵخۆشم.
(٤) بەربوك: ئەو ئافرەتەی دەچێت بەدوای بوکدا دەهێنێتە ماڵی زاوا، پوپ چەرمك: ریش سپی، دەلیل: بەڵگە، زومرە: دەستە، مەحشورم: هاونشین: هاودەم.
واتە من نەبوومە ریش سپی نێوان بوك و خەسوو هەتا ناوبژیوانی نێوانیان بکەم بەڵام سەرەڕای ئەوەش هەردەم دەستم بەرز کردۆتەوە دوعا دەکەم کە هاونشین و هاودەمی ئەو دەستە و کۆمەڵەیەم.

لــە خەیمــەی ســاحیبی ســەیف و قەلــەم وەزعــی عـیلم وابــوو
ســەدای تــەپلی بەشــارەت بــوو بلــی فــەتحیم و مەنســورم[١]
بــە نەقــدی گــەر حــەیاتی عــار بــە قابیــل بــە تەقدیمــە
نەســاری فــەرمودا وابلـیم ســەد شــوکر بــۆ پــارە مــەنزوورم[٢]
خەیاڵی قەسدی قەسدت بوو کــە دەســتی نەشــتەرت لــەرزی
لەبــەر پێــی مــودەعی کـــەوتووی دڵــی پــاک شــورم[٣]
لــە ســۆزی ســینە عــودا مەجمــەری بــەزمی موحیبــانم
لەگەڵ ئەفسوردەیش بــوو گــەرمی مەجلیســی ئــاگر ســورم[٤]

---

(١) خەیمە: رەشماڵ، ساحیبی سەیف: خاوەن شیر، فەتحیم: رزگار کەر، مەنسور: یارمەتی دراو.
واتە لە ژێر سایەی خاوەنی شیر و قەڵەم وەزعی زانست وای لێهاتووە دەنگ بداتەوە هەروەکو ئەو تەپڵە لێ دەدرێ بە ئاشکرا دەنگی مزگێنی بڵاوبۆتەوە کە دەڵێت من رزگارکەر و یارمەتی دراوم.
(٢) عار: عەیب نەنگ، قابیل: شایستە.
واتە هەر کەسێ کە ژیانی خۆی بە نەنگی بەڕیوەببات ئەو ژیانەی شایستەی ئەوەیە نەمێنێ چونکە ژیان ئەوەیە بە سەربەرزی بژی بۆیە ئێستا من سەد شوکری خوا دەکەم لەسەر ئەوەی کە شایستەی ئەو ژیانەم.
(٣) قەسد: مەبەست، قەسد: بڕین، مودەعی: ئەوەی داوای لەسەر خەڵك هەیە.
واتە ئەو خەیاڵەی کە تۆ هەتە مەبەست بڕینی دەستی بەرامبەرتە کاتێك دەتەوێ دەستی نەشتەری لەرزینت بیڕی، بۆیە وا کەوتوی بەسەر دەست و پێی ئەو کەسە کە داوای لەسەر تۆ هەیە، بەوەش سنورت کە دڵ پاك و نسۆراوی من وەرگرتووە.
(٤) عود: دار ئامێری مۆسیقا، موجمەر: ئاگردان، موحیبان: خۆشەویستان.
واتە ئەو سۆز و خۆشەویستیەی لە سینە و دڵ و دەروونمدا هەیە بەرامبەر بەزمی خۆشەویستانم وەکو ئەو دارەیە کە دەیهاوێنە ناو ئاگردان چۆن قرچە قرچی لێوە دێت دڵی منیش هەروایە، بەڵام لەگەل ئەوەشدا دڵگران بووی کاتێك لە کۆڕی مەجلیسان دادەنیشتم گەرم دەبووم وەکو ئاگردان سور هەڵدەگەڕام.

و جـودم گــەر خراپــە رەنجــە دڵ، هــەر مــەخزەنی گەنجــە
بــۆ ســەیرانیش لــە لای ئــەهلی دەرون ئابــاد و مــەعمورم[1]
قوتــابی نــیم لــە هــەوڵی نــان و شــەکر و لوقمــە قــازی
لــە ئــەهلی تــالبی تەحســیل و ذکــر و ورد مەئســـورم[2]
دەڵــێ بیســتومە خوانەخواســتە گــیر نــەبووە هــیچ تــیرت
لــە دەســت کــەوتووی لــە بەرپێــدا دڵــی بێــزار و بــێ زورم[3]
لە فەتحی بابی خێر وەك ابو الحسن بــۆ قــەڵای خەیبــەر روی
چە خێر بوو وا لەدەس چووی هەر ئەڵێی من تــەرکی مــامورم[4]

---

(١) وجود: بوون، ئابد و مەعمور: ئاوەدان.
واتە بوونی من گەر سوودی نیە نەبوونی باشترە هەموو رەنج بەفیڕۆ رۆیشت بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دڵ و دەروونم هێشتا هەر گەنجییەتی پێوە ماوە و دیارە بۆیە لای ئەهلی دەروونناسان کاتێك لە سەیران و رابواردندان هەر ئاوەدانیە.

(٢) تاڵب: داواکار، لوقمەی قازی: جۆرە شیرنیەکە دەخورێت، تەحسیل: بەدەست هێنان، مەئسور: قسە گێرانەوەی پشتا و پشت.
واتە من ئێستا قوتابی نیم هەتا بەدوای ژەمی رۆژانە و شەکر و لوقمەی قازیدا بگەڕێم! جاران قوتابی ئاینی(فەقێ) راتبەیان هەبوو خواردنیان کۆدەکردەوە لە ماڵان دەیانگوت (راتبە و رەحمەت) بەڵام ئێستا شوکر ئەو قۆناغەم بڕیوە ئەهلی زاست و زانیارم و بەدوای بە دەست هێنانی زیکری خودا و قسە و باسی پێشینام.

(٣) زور: فرت و فێڵ
واتە دەڵێت وام بیستووە کە ئەو تیرانەی هاویشتۆتە خوانەخواستە هیچی جێگای خۆی نەگرتووە هیچ لە تیرەکانت جێگای خۆی نەگرتووە، بۆیە ئێستا لە دەست کەوتووی جا مادام وایە ئەوە دڵی بێزار و بێ فرت و فێڵم لەبەر پێدا بێ.

(٤) فەتح: رزگار کردن، بای خێر: دەرگای خێر، ابو الحسن: مەبەست ئیمامی عەلی کوڕی ئەبی تاڵب، قەڵای خەیبەر: شوێنێك بوو نزیك مەدینە جولەکەی تێدا نیشتەجێ بووە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) بە سەرۆکایەتی عەلی کوڕی ئەبو تاڵب فەتح کرا.

لە دەعوا دا یەدی بەیزا عەسای موسات لە دەستا بوو

ئیجازەی ماری خۆشت پێ نەما فەرمووتە مەسحورم [١]

بە مەرگی تۆ دەلیلی یا بلدیە بوو هەموو لایەك

مەلا دەرس لابەلا گاهی سەرەوخوار گە سەرەوژوورم [٢]

---

واتە بۆ کردنەەی دەرگای خێر عەلی کوڕی ئەبو تالب بە خۆی و سوپاکەی ڕۆیشت بۆ ئەوەی قەلای خەیبەر فەتح بکات، ئێستا چ خێرە وەها لەدەست دەرچووی هەروەك ئەوەی یەکێك کارێکی پێ راسپێردارێ و تەرکی کردبێت نەیکا.

(١) یەدی بەیزا: دەستی سپی و درەوشاوە، مەبەست دەستی حەزرەتی موسایە کە قورئان باسی دەکات و دەڵێت هەر کاتێك حەزرەتی موسا دەستی لە باخەڵیا دەنا و دەر دەهێنا سپی و دەبوو دەدرەو شاوە

﴿وَٱضۡمُمۡ يَدَكَ إِلَىٰ جَنَاحِكَ تَخۡرُجۡ بَيۡضَآءَ مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٍ ءَايَةً أُخۡرَىٰ﴾ (طه: ٢٢).

﴿وَأَدۡخِلۡ يَدَكَ فِي جَيۡبِكَ تَخۡرُجۡ بَيۡضَآءَ مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٍۖ فِي تِسۡعِ ءَايَٰتٍ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ﴾(النمل: ١٢)

(عەسای موسا) گۆپاڵەکەی موسا ﴿قَالَ هِيَ عَصَايَ أَتَوَكَّؤُاْ عَلَيۡهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِي وَلِيَ فِيهَا مَـَٔارِبُ أُخۡرَىٰ﴾(طه: ١٨) هەرکاتێك گۆپاڵەکەی فڕێ دەدا دەبووە مارێکی گەورە و مارەکانی جادوگەرانی فرعەونی قوت دەدا.

﴿وَأَلۡقِ عَصَاكَۚ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهۡتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنّٞ وَلَّىٰ مُدۡبِرٗا وَلَمۡ يُعَقِّبۡۚ يَٰمُوسَىٰ لَا تَخَفۡ إِنِّي لَا يَخَافُ لَدَيَّ ٱلۡمُرۡسَلُونَ﴾(النمل:١٠).

واتە لە داواکەت هەردوو بەڵگەی موعجیزەی حەزرەتی موسات بەدەستەوە بوو یەکێکیان گۆپاڵەکەی و ئەوی دیکە موعجیزەی دەست سپی و درەوشاوەی لەکاتێکدا خۆت ئیجازەی ئەو مارەی خۆت پێ نەمابوو دەتگوت جادوم لێ کراوە پێك چونێك هەیە لە نێوان گۆپاڵەکەی حەزرەتی موسا کە هەر کاتێك فڕێی دەدا دەبووە مارێکی گەورە و هەروەها مار خۆشت واتە زوڵفی رەشت کە بە ماری چواندووە.

(٢) واتە بە مەرگی تۆ قەسەم کە دەلیلی هەموو هاوشاریانی بە هەموو لایەکدا دێ و دەچی منیش وەکو مەلایەك کەوانەی لابەلا دەڵێتەوە جارێك سەر بەرەوژوور دەڕۆم و جارێکی دیکە سەر بەرەو خوار.

بــــــە قوربــــــان ئێســــــتە هیجرانــــــت دەناســــــم
کــــــە نــــــاری فیرقــــــەتت بووەتــــــە لیباســــــم(١)
بــــــەبێ دوکــــــانی حوســــــنت مودەتێکــــــە
لــــــە بــــــازاری ڕەواجــــــا مــــــن کەساســــــم(٢)
مشــــــوەش بــــــوو وەکــــــو کــــــالۆلی تــــــۆ
لــــــەف و نەشــــــری خــــــەیاڵتی قیاســــــم(٣)

---

(١) هیجران: دوور لە دۆست و برادەران، نار: ئاگر، فیرقەت: جیابوونەوە، لیباس: جل و بەرگ
واتە بەقوربان ئێستا دوور لە دۆست و برادەران و خۆشەویستان تۆ دەناسم نرخی تۆم لەلا پەیدا بووە تۆ لەلام گەورەی، کە هەر کاتێکیش لێت جیا دەبمەوە وا هەست دەکەم جل و بەرگی ئاگرینم لەبەردایە و هەردەم لەنێو ئاگری دۆزەخدام.
(٢) حوسن: جوان، مودەتێکە: ماوەیەکە، ڕەواج: بڕەوپێدان، کەساس: بێ کەس.
واتە ماوەیەکە بەبێ ئەوەی دوکانی خۆت دابنێ و جوانیت بخەیتەڕوو من لێی دوورم ئەگەر چی ئەمڕۆ لە بازاڕدا جوانیت بڕەوی پێ دەدرێت، من کەساسم هۆکارەکەش هەر ئەوەیە کە دوورم لە جوانی تۆ.
(٣) مشوەش: سەرلێشێواو، کاکۆل: پەرچەم ئەو موانەی دێتە سەر نێوچەوان، لەف و نەشر: پێچەوانە و بڵاوبوونەوە لە زاراوی زانستی ئەدەبدا ئەوەیە کە شاعیر چەند وشەیێك یا چەند ناوێك لە دێرە شیعرێك دابهێنێ، وە لە دێرە شیعری داهاتوودا سیفەت و بۆ ئەو وشانە بهێنێ، بەو وشە و ناوانە دەڵێن (لەف)، وە بە سیفەت و بەراوردەکانیشی دەڵێن (نەشر)، لەف و نەشر سێ جۆرە: (١) لەفو نەشری مورەتەب واتە بە وشەی یەکەمی نەشر پێوەندی بە وشەی یەکەمی لەفەوە دەبێ، وە دووەم بە بە دووەم و سێیەم بە سێیەم تا دوایی (٢) لەف و نەشری مەعکوس واتە وشەی یەکەمی نەشر پەیوەندی بە وشەی دوایی لەففەوە دەبێ (٣) لەف و نەشری موشەوەش ئەوەیە کە تەرتیب و دەستوری تایبەتی و دیارکراوی نییە.
واتە لەف و نەشری هۆنینەوەی هۆنراوەکانم کە بەراوردی دەکەم لەگەڵ بەراورد کردنی خەیاڵاتم هەروەکو پەرچەمی نێوچەوانی تۆ ئاڵۆز و پەشۆکاو بووە.

بە تابوری بلوکی نووکی موژگان
شکا تەرتیبی نیزامی حەواسم[1]

بە تیرێکت کە جەرگت پارە کردم
مەگەر بەو پارە من هەربو خەلاسم[2]

کە خالی لێوی لەعلت زەهیر بێ
لە خدری زیندە نابێ ئیلتماسم[3]

کەشک نابەم گولی رووی لالە رەنگت
ئەوا موحتاجی رووی لالە عەباسم[4]

---

(١)تابور: دارەمەیت، درێژ و جوان، موژگان: برژانگ، تابوری موژگان: برژانگی جوان و درێژی یارە، حەواس: هەستەکان.
واتە برژانگی درێژ و جوانی تۆ هێندە نوکی درێژە هەر کاتێك ئەو موژگانە دەهاوێی بۆ من هەرچی هەستەکانم هەیە هەموو دەشکێنی یەك لەدوای یەك وە هەرچی نیزامی هەست هەی دەیشێوێنیێ.

(٢)پارە کردم: لەت کردم، خەلاسم: کۆتاییم.
واتە ئەو کاتەی تیری موژگانت تێکرت و دات لە جەرگم و لەت لەتت کرد ئەی هەر ئەو تیرەی دات لە جەرگم لەت لەتت کرد کۆتایی بە ژیانم هێنا.

(٣)لەعل: یەکێکە لە بەردە بەنرخەکان و رەنگی سورە وەکو یاقوت وایە کینایەیە بۆ جوانی لێوی یار، ئیلتماس: داواکردنی شت لە خەڵك، زەهیر: خواردنێکی کوشندەیە.
واتە ئەو خاڵەی کە لەسەر لێوی سور و جوانتە، من بیگەمێ ماچی بکەم با زەهیریش بێت پێی بمرم هەر پێم خۆشە، لەو کاتەش هیچ پێویستم بە خدری زیندە نیە هەتا داوای چابوونەوەی لێ بکەم.

(٤)شك: گومان
واتە بێجگە لە رووی جوانی تۆ کە هێندە گەش و جوانە و هەر دەڵێی گوڵی ئاڵە هیچ شتێکی دیکە شك نابەم، کە رووی تۆشم هەبێت و تەماشای بکەم و دڵم پێی خۆش بێت

لەبــــەر تەعنــــە عـــــوام ئەندێشــــە ناكـــــەم
كـــە مـــن عاشـــق بـــەگوڵ غونچـــەی خەواســـم[1]
بـــە شـــەمعی جـــەمعی روخســـارت (حـــەریقی)
نەســـــیمی ئیلتقـــــای تـــــۆ دەناســـــم[2]

---

ئەو كاتە هیچ پێویستم بە رووی گوڵی لالە عەباس نیە چونكە دڵم پێی خۆش نابێت.

(١)تەعنـە: شـكاندنەوەی خـەڵك، قسـە پێگـوتن بـە ناهـەق، عـوام: گشـتی: خـەڵكی رەشـۆك، خەواس: خاس كەسانی چاك، كەسانی نزیك لە خۆم.

واتە من لەبەر قسە و قەسلۆكی خەڵكی رەشۆك هێندە بیركردنەوەی قـوڵ ناكـەم و گوێیـان پێ نادەم، چونكە ئاشكرایە من عاشق و هاونشین و خۆشەویستی گول و خونچەی كەسـانی باش و نزیك لە خۆمن.

(٢) شەمع: چرا مۆم، نەسیم: شنەبا، ئیلتقا: بەیەك گەیشتن.

واتە بە كۆكردنەوەی چرای جوانیت كە لە روخسارت دا دیارە حەریقی چاك دەتناسمـەوە وە هەروەها بەو شنە بایەی كە لەلای تۆوە دێت هـەموویان كۆكراونەتـەوە یـەكیان گرتـووە ئـا بەو سیفاتانە دەتناسمەوە.

کـــەی دێیـــەوە ســـەر رەحمـــی دڵـــی زار و نـــەزارم
کـــەی دێ قـــەدەمی خـــێرەت لەســـەر خـــاکی مـــەزارم(١)
تاکـــەی لـــە تـــەوافی حـــەرەمی قیبلـــەی ئـــەبرۆت
وەک پەرچـــەمی پیشـــانی ســـەر ئەفگنـــدە و خـــوارم(٢)
جـــاری نـــەبوو جـــاری نـــەبێ فرمێســـکی نەدامـــەت
بـــاری نـــەبوو بـــاری نەیـــەنی بـــۆ دڵـــی زارم(٣)
قوربـــت ســـەبەبی بوعـــدە لـــە یـــار و لـــە دیـــارم
رازیـــم بـــە جـــەفا گـــەر بـــە وەفـــایی یـــە دیـــارم(٤)

(١) زار و نەزارم: غەمگین و دەردەدار و مات و مەلولن قەدەمی خێرت: بەخێرهاتنت، مەزار: گۆڕ.
واتە کەی جارێك رەحم دەکەی و بێیتە خەیاڵت بەڵکو بەزەیت بە دڵی غەمکین و دەردەدار و مات و مەلوم بێتەوە، چونکە من کوژراوی دەستەی تۆم، هەروەها کەی ئەو رۆژە دێت بە خێر و بەرەکەت رێگا بکەوێتە سەر خاکی گۆڕەکەم و ئاورم لێ بدەیتەوە.
(٢) تەواف: سوڕانەوە
واتە: من هەتا کەی وەکو ئەو پەرچەمە بم لە هەردەم پەرچەمت شۆڕ بۆتەوە سەر شان و ملت منیش وەکو ئەو پەرچەمە بەرامبەر بە قیبلەی ئەبرۆت راوەستاوم تەوافی دەکەم هەروەکو چۆن لە حەرەم تواف دەکرێت.
(٣) جاری: جارێك، جاری: رۆیشتوو، نەدامەت: پەشیمانی.
واتە جارێك نەبوو فرمێسکی پەشیمانی نەرێژی هیچ کاتێکیش نەبوو زەحمەت و ئێش و ئازار و بۆ دڵی غەمگینم نەیەنێ.
(٤) قورب: نزیك، بوعد: دوور، سەبەب: هۆ، جەفا: شتی بێ کەڵك.
نزیك بوونەوەت هۆیە بۆ دووری لە یار و خۆشەویستانم چونکە گەر تۆ لێم نزیك بێیتەوە هەر تۆم لەبەر چاو دەبێت ئاگام لە یار و دیار نامێنێ هەر کاتێکیش ئاگام لێیان نەمێنێ واتە لێیان دوورم، بۆیە من رازیم بە جەفا کێشان گەر لە شوێنی خۆم بمێنمەوە بە وەفایی تێدەگەم.

بۆ لەزەتی عەفوت کە جەریئم لە مەعاسی

مەدرێنە دەخیل پەردەی روخساری کارم[1]

چت داوە لە روو ترشی و سرکە دەمی ئەغیار

قەندی لەبت شیرین بە دەمی تالی خومارم[2]

ئەی عەرعەری بیستانی هیدایەت وەرە باغان

داغانی قیامەت کە قەد سەروو چنارم[3]

---

(١) لەزەت: خۆشی، جەرئ: بوێری، مەعاسی: کوی عاسی: گوناهکار، دەخیل: دەستە و دامان.

من گەلێك بوێر و چاو نەترسم بۆ ئەنجامدانی گوناه و تاوان ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە چونکە هەر کاتێك تاوان و گوناه ئەنجام دەدەم تۆ لێبووردنم بۆ دەردەکەی منیش تام و چێژ لەو لێبووردنە دەکەم، جا دەی کەوایە دەستەو دامانت بم ئەو پەردەیەی لە نێوان روخسار و کارەکانم دایە مەیدڕێنە.

(٢) رووترش: تووڕەیی، سرکە: شلەیەکە لە هەنار و ترێ دروست دەکرێت تامەکەی ترشە کینایەیە بۆ کەسێك کە تووڕە و توند بێت کەسێك تووڕە و توند بێت پێی دەڵێن (دەڵێی سرکەی دەفرۆشی) واتە قسەی رەق دەکات، ئەغیار: بێگانە، قەند: شەکر واتە قسە خۆش، لەب: لێو، خومار: پاش خواردنەوەی مەی ئەو لەش قورسی و گرانییە و سەر ئێشەی بەسەر مەی خۆر دێت.

واتە تۆ چ پەیوەندیت بە کەسانی بێگانە و تووڕە و توندەوە هەیە کە هەردەم قسەی رەق دەکەن بەرامبەر من تۆ بۆ ئەوەی پەیوەندی نێوانمان تێك بچێت وەرەوە سەر بەزمی خۆت کە شەکر لە لێوەکانت دەبارێ کە ئەو قەندە شەکرە بۆ دەمی تاڵی من شیرینە.

(٣) عەرعەر: مەبەست بالای بەرز و جوانی یارە، بیسان: باغ، داغانی: داغ ئاسنی گەرم کراو بە لەشی کەسێکەوە بنێ و نیشانەی پێوە دیار بێت، قەد سەروو: دارێکە درێژە پەلکی پانە، چنار: داری چنار دارێکی بەرزە.

واتە ئەی یاری بالا بەرزی نێو باغی هیدایەت دراوان وەرە نێو باغان، ئێمە داغ بکە بە نیشانەی داغ کراوی رۆژی قیامەت بەڵکو بەو نیشانەوە بناسرێتەوە هەروەکو چۆن داری سەر و چنار لەناو هەموو دارێك دەناسرێتەوە.

گــوێ مــەگرە لــە ئــەهرار و ئەصــداری ڕەقیبــان
ســەد غــەزەبت بــی مــن لــە عــەفومت چــاوەڕوانم[١]
تــا دیومــە لــە نێــو مەســحەفی ڕووت ســورەی یوســف
بــۆ ئایــەتی حوســنت لــە هــەموو ڕەسمــی کــەنارم[٢]
تاووســی کــە لەســەر زینــەتی بــالی ســەری دانــا
ئــەمنیش بــە پــڕ فکــرەوە بــی ســەبر و قــەرارم[٣]
پەروانــەی شــەوقت مەخــەرە ئــاگری میحنــەت
شــەمی دڵەکــەت هەڵکــە لــە بــۆ بــەزمی نیگــارم[٤]

---

(١) ئەهرار: ئاژاوە و قسەی نارێك، ئەصدار: دەرچوون، ڕەقیب: دوژمن، غەزەب: توڕە.
واتە ئەو دێرە پەیوەندی بە دێری پێشەوە هەیە واتە بەسە چی دیکە گوێ مەگرە لە قسەی نارێك و هیچ و پوچی دوژمنان کە دەیکەن، تۆ چەند توڕەبیت بەرامبەر بە من، بەڵام من هەر چاوەڕوانی لێ بوردنی تۆم.
(٢) مەسحەف: کتێبی پیرۆز، سورەی یوسف: سورەتێکە لە قورئانی پیرۆز.
واتە من دیومە ڕووی تۆ لە نێو سورەتی یوسفدا کە لە کتێبی پیرۆزدا هەیە مەبەست جوانی و سیفەتی بەرزی هەیە بۆ ئایەتی جوانیت من بەش بە حاڵی خۆم کەنارم گرتووە لە هەموو وێنەیەك چونکە هیچ جوانیەك ناگاتە جوانی تۆ وەکو ئەو جوانییەی یوسف سەلامی خوای لێ بێت.
(٣) تاووس: باڵندەیەکی پەڕ جوانە، زینە: جوان.
واتە تاووس هێندە بە جوانی خۆی دەنازێ و شانازی بە خۆیەوە دەکرد هەتا کار گەیشتە ئەو ڕادەیە سەری خۆی لە پێناویدا دابنێ، منیش وەکو تاووس بەڵام نەك بە جوانی بەڵکو هەردەم بیر دەکەمەوە، بەهۆی ئەو بیرکردنەوە لە جوانیت ئارام لێ بڕاوە.
(٤) پەروانە: پەپولە، میحنەت: دەرد و بەڵا، شەمع: مۆم
پەپولە زۆر عەشقی مۆمە هەردەم بە دەوری ئاگرەکەیدا دەسوڕێتەوە و لێی نزیك دەبێتەوە هەتا باڵەکانی لە ئاگرە دەدا و دەسوتێ، تۆش وەکو پەروانە شەوقی ئاگرەکە مەدە با نەسووتێ و خۆت تووش دەرد و بەڵا مەکە، بەڵکو ڕووناکی دڵەکەت داگیرسێنە بۆ ئەوەی بەزمی نیگارت دەرکەوێ.

مورەی دڵی بەرد زلف لە بۆ تەختی سینە

لەم نەردە مەڵێن مەیە دێم فێری قومارم[1]

گەر باڵ و پەڕی بەخت نەسوتایە (حەریقی)

بۆ صەیدی مەعانی بە میسلی بازی شکارم[2]

---

(١) نەرد: زار کە یاری تاوڵەی پێ دەکرێ

واتە دڵی وەکو بەرد رەقە زوڵفیشی شۆڕ بۆتەوە بۆ سەر تەختی سینەی جا ئەوەش وەکو یاری زار زارێن وایە خەڵکی هیچ نەڵێن دەربارەی من یارم بەڵکو ئەو زارە فڕی دەدەم چونکە من فێری یاری قومار کردنم.

(٢) صەید: ڕاو، باز: باڵندەیەکی گۆشت خۆرە و راوی باڵندە دەکات، شکار: نێچیر.

واتە ئەو دێرە پەیوەندی بە دێری پازمەوە هەیە کاتێك باڵی پەروانە نەسوتابایە کە ئەوەش دەردی بەد بەختییە بۆیە بۆ راوکردن هەروکو ئەو بازە وام کە هەردەم راوی نێچیر دەکات.

بــۆ جــەمعی غــەم و شــادی نــەبوو رۆژی مــەحرەم
رووت بــەرگی گــولی شــادی و زولفــت شــەوی ماتــەم[١]
بــەم وەجهــە دەلــێن مەســحەف و بــەو نوقتــە ئــەڵێن دەم
بــەو زولفــە ئــەلێن قەیــد و بــەو حاشــیە پەرچــەم[٢]
تەفســـیری شـــەوی وصـــل و غـــەمی رۆژی مەزاقـــە
مەشــهور لــە دنیــا بــە بەهەشــت و بــە جەهــەنم[٣]

(١) جەمع: کۆکردنەوە، مەحرەم کەسانی نزیك ئەوانەی دەستنوێژییان لەیەك ناشکێت، ماتەم: پرسە.
واتە بۆ کۆکردنەوەی شتە غەمناکەکان و ناخۆشەکان لەگەڵ شتە خۆشی و شادییەکاندا جارێك نەبوو لەگەڵ کەسە نزیکەکاندا بەیەکەوە کۆببنەوە، ئەویش بەهۆی ئەوەی رووت هەروەکو گول گەش و جوانە و شادی دەبەخشێت بە مرۆڤ هەر کاتێکیش زولفی رەشت دێتە خوارەوە و رووت دادەپۆشێت بەوە دەبێتە تاریکی دیارە ئەو تاریکییەش هێمای ماتەمینییە.
(٢) وەجهە: روخسار، مەسحەف: کتێب، نوقتە: کەسی دەم جوان، قەید: کۆت و بەند حەپس کردن، حاشیە: ژێری لاپەڕەی کتێب کە شەرعی وشەیەك دەکات.
واتە ئەو روخسارانەی تۆ هێندە گەش و جوانە هەر دەڵێی لاپەڕەی کتێبە وەکو ئەوەی لاپەرەی کتێب هەڵدەدرێتەوە رووشت کاتێك وەردەگێری بەلایەکی دیکەدا دەسورێنی لە کتێب دەچێت وە ئەو نوقتانەی ناو کتێبەکەش وەکو دەم و ددانەکانت جوانە، جووتە زولفەکانیش هەر کاتێك بەسەر روخسار دێتە خوارەوە وەك کۆت و بەندی حاشیەی نووسینی زایە کە پەرچەمت شەرحی کتێبەك دەکات.
(٣) تەفسیر: لێکدانەوە، وەسل: بەیەك گەیشتن، مەزاقك تام و چێژ، مەشهور: بەناوبانگ.
واتە ئەو رۆژە رۆژی ئەوەیە کە بێین لێکدانەوە بۆ شەوی بەیەك گەیشتن بکەین لەگەڵ ئەوەی ئەو رۆژەی تام چێژ لەو بەیەك گەیشتنە دەکرێت، هەروەکو ئەوە بەناوبانگە لە دنیادا کە بەهەشت مایەی خۆش و جەهەنەم مایەی دڵتەنگی. جەهەنەم شەوی وەسل بەهەشتیش رۆژی مەزاق.

تەقسیمی ئەزەل وابوو لە دوای من و یارم
بۆ سەیری ئەم و صەید و رەقیب کەلبی موعەلەم[1]
تەسبیحی سەنای زولفی خەیاتە و لەبی مەرجان
سەر رشتەی لە ئێمە دەوی بۆ عەقدی مونەزەم[2]
شادی ئەسەری مەستییە بێ شەرت و وەفایە
بۆ فرسەتی تەنگانە غەمە مونس و مەحرەم[3]
عومری کە ئەساسی هەوەسی بازی نەفەسی بێ

---

(١) ئەزەل: واتە شتێك سەرەتای نەبێت هەرشتێکیش سەرەتای نەبێت کۆتایشی نیە بە بۆچوونی ئاینی خوای گەورە ئەزەلییە چونکە نە سەرەتا و نە کۆتایی هەیە، ئەو وشەیە گەلێك جار لەگەڵ ئەبدی دێت بەڵام جیاوازیان هەیە وشەی ئەبەدی شتێکە سەرەتای هەیە بەڵام کۆتایی نییە وەکو مرۆڤ، صەید: راو، رەقیب: دوژمن.
واتە هەر لە ئەزەلەوە بەشی من و یارم وابووە کە رەقیب هەر بە دوامانەوە بێت و سەیر و چاودێریمان بکات هەروەکو چۆن سەگێکی فێرکراو دەچێت راوی نێچیر دەکات ئەو دوژمنەی ئێمە سەگ ئاسا هەر بەدوامانەوەیە.
(٢) سەنا: ستایش، لەب: لێو، مەرجان: بەردێکی سوری گرانبەهایە لە زەریادا هەیە بۆ کاری زێرینگەری بەکاردێت، سەر رشتە: دەفتەری حیسابات، مونەزەم: رێك و پێك.
واتە تەسبیحات و ستایش دەبێ بکرێت بۆ ئەو لێوە سورە جوانەی کە وەکو مەرجان وایە کە هەردەم تەسبیحاتی پێ دەکرێت قەسەو ستایشی خەڵکی بێ دەکرێت چونکە رۆژێك دادێت داوای دەفتەری حساباتمان لێ دەکرێت لەبەرامبەر ئەو گرێبەستە رێك و پێکەی کردوومانە.
(٣) ئەسەر: شوێنەوار، مەستی: سەرخۆش، مونس: دڵدەرەوە.
واتە کەسێك کاتێك بە مەی خواردنەوە مەست دەبێت شادی پێوە دیارە، بەڵام ئەو شادییە هەتا سەر نییە، هەر کاتێك مەستییەکە نەما شادییەکەش لەگەڵ دەڕوا و نامێنێ ئەوەش بەڵگەی بێ شەرتی و وەفاییە چونکە هەر کاتێك تەنگانە هات غەم فرسەت وەردەگرێ بەسەریدا زاڵ دەبێت، بەڵام ئەوانەی لەلات دادەنیشن کەسە نزیکەکان دەبنە غەمڕەوێن.

قابیـــل نیـــه بـــۆ خێـــوی شـــادی و ئەلـــەم و غـــەم[١]
بـــێ ســـێبەر و ســـەبرگر شـــەوقێکە مـــودارا
نـــەم دیـــوە لـــە گـــەرما و لـــە ســـەرما دلـــی خـــورەم[٢]
بـــۆ دلبـــەری مـــەعنا لـــە حـــەرەمی ئەســـرار
خـــۆی قەلـــەم مـــاوە (حـــەریق) ئێســـتە بـــە مـــەحرەم[٣]

---

(١) قابیل: شایان، ئەلەم: ئازار، عومر: تەمەن، هەوەس بازی: رابواردن.
واتە هەر کەسێك کە تەمەنی خۆی لە هەوا و هەوس سەرف بکات یاخود بنچینەی تەمەنەکەی لەو رێگایە سەرف بکات یاخود ملکەچی نەفسی خۆی بێت، دیارە ئەو کەسە یاخود ئەو نەفسە شایانی ئەوەیە کە هەردەم لە ئێش و ئازار و غەم خەفەتدا بێت.
پێکهاتەی کەسایەتی لای فرۆید لە سێ بەش پێکهاتووە:
١-(هو) لەگەڵ مرۆڤدا لەدایك دەبێت، سەرچاوەی چێژ وەرگرتنە، واتە هەردەم لە هەوڵی تێرکردنی حەز و ئارەزووەکانیەتی بێ ئەوەی گوێ بداتە داب و نەرێت و بەها ئەخلاقییەکان.
٢-من(Ego) رۆڵی ناوبژیوان دەبینێت لە نێوان جیهانی دەرەوە و خواست و ئارەزووەکانی (هو) و هەوڵ دەدات بەپێی واقعی دەوروبەر هەڵسوکەوت بکات، بەگوێرەی بۆچوونی دەروونزان فرۆید ئەرکی من گرانە چونکە کارێکی زەحمەت و دژوارە کە بتوانێت ئەو دوو شتە بگەینێتە یەك چارەسەری گونجاوییان بۆ بدۆزێتەوە.
٣-منی باڵا (Super Ego) دەستکەوتی پەروەردەی تاکە لە ژینگەی کە تێدا دەژی بۆ وەرگرتنی پاداشت و سزا، هەروەها لە منی باڵا، منی نموونەیی و ویژدان هەیە، منی نموونەیی هەردەم لە هەوڵی لەناوبردنی حەز و ئارەزووەکانی (هو) دایە.
(٢) مودرا: رەفتار لەگەڵ خەڵك بە میهرەبانی، خورەم: شاد کەیف خۆش.
واتە بێ سیبەر و بێ پشتیوان و بێ ئارام و بەڵام گروتین و شەوقێکی هەیە کاتێك لەگەڵ مەردومدا دادەنیشێت و بە میهرەبانی قسەیان لەگەڵ دەکات نەمدیوە لە هیچ کاتێکدا خۆشی و شادی نە لە گەرما و نە لە سەرما.
(٣) دلبەر: یار، ئەسرار: کۆی سەرە واتە نهێنی.
واتە بۆ یارەکەم نهێنیەکان دەپارێزم هەروەکو چۆن نهێنی خزم و کەسانم دەپارێزم چونکە

بلبلـــی دووری گـــوڵ و تـــوتی شـــەکەر شـــەکەنم
قـــومری ســـەروی خـــەرامان و تـــەرزی چـــەمەنم[1]
بـــێ نـــەواو ســاحیب ئـــاوازی حـــەزینم بـــە نـــەوا
شـــەمی هـــەر جـــەمعم و پەروانـــەی هـــەر ئەنجمـــەنم[2]
ســـوحبەتی قودســـی و ســـەیری مەلـــەکوتم دانـــا
بەعیلاقـــەی ئـــەم و ئـــەو هەمـــدەمی زاغ و زەغـــەنم[3]
لـــەزەتی جەنـــەتی رووم داوە بـــە دانـــەی خـــالی
ئەمـــە ئیرســـی پدەریمـــە بـــە پســـر بـــێ دەکـــەنم[4]

---

(حەریق) ئێستا ئەوەی مابێتی لە خزم و کەسانی تەنها خۆی و قەڵەمەکەیەتی کە بتوانێت نهێنییەکان بنووسێتەوە.

(١) توتی: باڵندەیەکە لاسایی دەکاتەوە، بە کەسێکیش دەڵێن هەر قسەی خەڵك دووبارە بکاتەوە، شەکەر شەکەنم: قسەخۆش، قومری: باڵندەیەکە بە کۆتر دەچێت (کوکوختی)، خەرامان: بە نازو فیز رۆیشتن، تەزەرو: ناوی باڵندەیەکە.
واتە تۆ وەکو بولبوڵ عەشقی گوڵی بەڵام ئێستا لە گوڵ دوورکەوتوویتەوە، کە چی دەبینم وەکو تووتی هەر دەڵێیو دەڵێیەوە، گوتەکانیشت دەڵێی شەکرە لە لێوت دەبارێ، دیسان وەکو قومری هێند بە ناز و عیشوە خۆت دەلەنگێنی یاخود وەکو تەزەر و نێو باخ و چەمەنی.

(٢) حەزین: غەمناك، نەوا: ئاهەنگ گێڕان، شەمع: چرا، جەمع: دەستە، ئەنجمەن: ئەنجومەن
واتە من ئێستا بێ نەوام لاتم و خاوەنی ئاوازێکی غەمبارم لەو ئاهەنگەدا کە دەیگێڕم، تۆش وەکو چرایەك دەدرەوشێیتەوە دەستە دەستە لە دەور و پشتت دانیشتون هەروەکو چۆن پەپولە لە دەوری چرا دەسوڕێتەوە عەشقی رووناکیەکەیە.

(٣) سوحبەت: هاودەم هاوڕێیەتی، قودس: پیرۆز، زاغ و زەغەن: غەم و خەفەت.
واتە من لەبەر پیرۆزی تۆ بوومەتە هاودەم و هاونشینی تۆ، هەروەکو چۆن سەیری فریشتەکان دەکرێت بە پیرۆزی بەڵام کاتێك لێت دوور دەبم و پەیوەندی لەگەڵ ئەم و ئەودا دەبەستم ئەو کاتانە غەم و خەفەت دامدەگرێت.

(٤) لەزەت: چێژ، جەنەت: بەهەشت، ئیرس: میرات، پدەر: باوك، پسەر: کوڕ .

مـــولکی تەجریـــدی بەجێهێشـــت و بەهەشـــتی دانـــا
ئێســـتە گـــیرۆدەی خـــار و خـــەس و داس و دەوەنم[١]
بـــە هـــەوای ئـــاوی حـــەیاتی دهـــنی و نـــۆش لـــەبی
خـــدری زینـــدەی سەرچـــاوەی چـــاە زەقـــەنم[٢]
هـەر سـەری مشـك و سـەری زولفـە قـەتارەی نەفسـم
مـــالیكی قافلـــەی چـــین و خـــەتا و خوتـــەنم[٣]

---

واتە خۆشی و چێژی بەهەشت لەلای من ئەوەیە کاتێك رووی تێدەکەم ئەو دانە خاڵە دەبینم لەسەر روومەتی یاخود سیبوری بەهەشتم بەوە دێت کە خاڵی سەر رووی دەبینم کە ئەوەش وەکو میراتی باوك وایە بۆ کوڕ وەریدەگرێ بە راستی ئەوە جێگای پێکەنینە.

(١) تەجرید: رووتبوونەوە و داماڵین، خار و خەس: درك و داڵ، داس: ئاسنێکی چەماوەیە دەغڵ و دانی پێ دەدورێتەوە، دەوەن: ئەو شوێنەی درك و داڵی تێدایە یان پاشماوەی دەغڵ و دان کاتێك دەدورێتەوە.

واتە هەرچی موڵك هەبوو هەموو لە خۆکردەوە دایڕنی دەستی لێ هەڵگرت، ئەوەش لە پێناو پەیداکردن و بەدەستهێنانی بەهەشت یاخود دنیای کردە قوربانی دوارۆژ بۆیە ئێستا عەشق و گیرۆدەی درك و داڵە بەدوای داسەوەیە بۆ ئەوەی لە دەوەن درك داڵ بدورێتەوە.

(٢) دەهن: دەم، لەب: لێو، چاە: بیرچاڵ، زەقەن: چاڵی چەناگە.

واتە هەر بەو ئومێدەوە دەژیم کە ئاوی حەیات بخۆمەوەبە لێوەکان نۆشی بکەم هەروەکو خدری زیندە چۆن ئاوی حەیاتی خواردۆتەوە کەواتە خدری زیندە بۆتە سەرچاوەی ئەو چاڵە کە لە چەناگەدا هەیە بۆ من.

(٣) مسك: ماددەیەکی بۆن خۆشە لە ناوکی مامزی موشك دێتە دەرێ، مامزی موشك جۆرە مامزێکە دوو کەڵبی درێژی هەیە وەکو نابی فیل، زۆرتر لە شاخەکانی هیمالایا دەژی لە ژێر سکی کیسەیێکی بچووکی وەکو دوومەڵ هەیە مادەیەکی پەیتی تێدایە کۆدەبێتەوە هەر کاتێك کە کیسەکە پڕ بوو مامزەکە هەست بە ئازار دەکا، ناچار لە بەرد دەخشێنێ تا دۆمەڵەکە دەتەقێ و ئاوی بۆرگەکە دەرژێتە سەر رووی زەوی وشك دەبێتەوە، ئەمە ماددەی موشکی بۆن خۆشە، خەتا و خۆتەن: باکوری وڵاتی چین.

واتە ئەو بۆنە خۆشەی هەر دەڵێی بۆنی مسکە کە لە سەر زولفی ئەوەوە دێت، ئەوە مایەی هەناسەدانی منە بۆیە من بوومەتە خاوەنی کاروانچییەکانی وڵاتی چین و خەتا و خۆتەر کە دەچن بۆ ئەو شوێنە بۆنی مسك لەو وڵاتە دەهێنن.

مەجمەعـــە ســـینە، وە فینجـــان مـــەم وە شـــەربەت دەم
خەلعـــەتی یـــارە کـــە زانیویـــە غـــەریبی وەتـــەنم[1]
قەنـــدی لیـــوی تەلـــەبی چـــانیە ساســـرکە مەکـــە
نـــەك بـــەتاڵی بـــدوی خەســـرەوی شـــیرین ســـوخەنم[2]
وەجـــدی مـــەجنون لـــە پیاڵـــەی غـــەمی لـــەیلا دایـــە
بـــە خـــەیالی لـــەبی شـــیرین (بیســـتون) هەڵدەکـــەنم[3]
شـــادی بێگانەیـــە خـــزمم غەمـــە گـــەر مردیشـــم
ئـــەوە وارس لـــە حیســـابی حـــەق و گـــور و کفـــنم[4]

---

(١) مەجمەعە: ئەو زەوییە خەڵك تێدا كۆدەبێتەوە، خەلعەت: ئەو جل و بەرگەی لەلایەن گەورەیەکەوە دەدرێت بە کەسێك.
واتە سینەی جێگای کۆبوونەوەی خەڵك واتە هەموو خەڵك لە سینەی جێگای دەبێتەوە کە هێندە گەورەیە وە ئەو شەربەتەی بەدەم دەخورێتەوە هەردوو فنجانی سەر سینەیەتی کاتێك یار زانی کە من خەڵکی ئەو نیشتمانە نیم غەریبیم جل و بەرگی خۆی بۆ ناردم.
(٢) تەندی لێو: قسەی شیرین و خۆش، چاتیە: باش نیە، سرکە مەکە:جوولە مەکە، سوخەن: گفتوگۆ.
واتە قسەخۆش و شیرینەکانی کە لە لێو دەردەچێت پاش نیە داوای لیّ بکەی جا بۆیە تۆ واباشە لە جێگای خۆت نەجولێنی ورتە نەیەت ئەوە زۆر باشترە لەوەی بە قسەی تاڵ و ترش بدوێنی چونکە تۆ وەکو خەسرەوی خۆشەویستی شیرین لە قسە و گفتوگۆا.
(٣) وەجد: دلّداری و خۆشەویستی، مەجنون: خۆشەویستی لەیلا.
واتە خۆشەویستی و ئەڤینداری مەجنون ئەوەتا کە هەردەم لە غەمی لەیلا دایە بۆیە هەردەم پیاڵە بە خەیاڵی لەیلاوە هەلدەدات، منیش بە خەیاڵی قسە خۆشەکانی کە لە لێوی شیرین دێتە دەرێ وەکو فەرهاد دەچم چیای بێستوون هەڵدەکەنم.
(٤)واتە شادی و خۆشی لای من بۆتە بێگانە چۆن کەسێك بێگانە بێت نامناسێت و سەردان و هاموشۆم ناکات شادیش بە هەمان شێوە، خزمیش غەمە هەروەکو چۆن خزم هەردەم هامۆشۆم دەکەن لە دەورمدان غەمیش خزم ئاسا هەردەم لەگەڵمدایە بۆیە ئەگەر لە غەما مردم میرات گرەکانم با حەق و حیسابی کفن و گۆرم لە ئەستۆ بگرن.

گـــەنجی فکـــرم کـــە لـــە نێـــو کـــونجی غـــەما دیویەتـــەوە
مـــــوڵکی شـــــادیم هەیــــە تــــا ســــاکنی بەیتولحـــــەزەنم[1]
تیرەکـــەی بـــێ خەتـــەر بـــاری کـــەمان ئـــەبرۆ (حـــەریق)
گـــەر چـــە ئـــەو رۆســـتەمە ئەلحـــەق ئـــەمنیش روبیتـــەنم[2]

---

(١)ساکن: نیشتەجێ، بەیتولحەزەن: ماڵی پڕ غەم و خەفەت لە شیعری کلاسیکیدا (بیت الحزن) ئاماژەیە بۆ ماڵی حەزرەتی (یعقوب).
واتە هەرچی گەنجی و جوانی بیرو فکرم هەیە هەمووی لە نێو کونجی غەما دیوەتەوە کەواتە لەو رۆژەوە کە خزم ناسیوە هەر لە نێو دەردی غەما بوویمە، موڵکی شادیم کوا هەیە، خۆمن ئێستا لە ماڵی غەمدا هەروەکو ماڵی حەزرەتی یعقوب شەو دەکەمەوە و لەو ماڵە نیشتەجێم.
(٢)خەتەر: ترسناک، روبیتەن: پاڵەوانێکی ئێرانە.
واتە یار کە ئەبرۆی وەکو کەمان وایە و هەر بەهۆی ئەبرۆی کەمانی تیرم بۆ دەهاوێت، بەڵام خۆشبەختانە ئەو تیرە مەترسی نیە، چونکە گەر ئەو وەکو رۆستەم پاڵەوانە منیش وەکو رۆبیتینم.

لــه خزمــەت قازیــا لاریــم نیــه بــۆ ســەر چــه جــای مــاڵم
چــه حکیمــت بــووه ئیشــاراتی نەفــەرمووی بــۆ شــیفای حــاڵم[١]
فــدای تەشــریفی ڕێگــەت بــی خــەراجی مولــك و جــان و دڵ
شــاری تــۆزی بــەرپێت بــی رەواجــی عــومری ســەد ســاڵم[٢]
دەمێکـــه چـــاوەرێی ســـورمەی غوبـــاری کـــوی خوبـــانم
بـــه خـــاکی مەقـــدەمی تـــو نائیـــل میعراجـــی ئامـــالم[٣]
لەبــەر تــەوق وەفــا ئــەم ووت کــه قــومری ســەروی بــاڵاتم
لەبـــەر تـــەنگی نەفـــەس حـــەیفی دڕی جـــەمعی پـــەروباڵم[٤]

---

(١) واته من هەر کاتێك له خزمەت قازایدا بم هیچ لاری و گلەییەکم نییـه کـه دەرهـەق بـه مـن چ بکات و بلێت ئەگەر بێتو هەموو سەر و ماڵم ببات، بەڵام نـازانم بۆچـی چ حیکمـەتێکی تێدا بووه ؟ که بەهیچ شێوەیەك ئاماژەکی نەکرد بۆ ئـەوەی شـیفای حـاڵم بێـت و لـەو ناخۆشـی تەنگانەیە رزگارم بێت، دیاره به ئاماژەی ئەو نەبێت چارەی حاڵم ناکرێت.

(٢)فدا: قوربانی، جان: گیان، نسار: قوربانی، رەواج: برەوپێدان.
واته هەموو شتێك له موڵك و گیـان و دڵ بـه قوربـانی ڕێگـای هـاتنی تشـریفت بێـت دیسـان هەموو شتێك به قوربانی ئەو تۆزەی بەرپێت بێت بۆ پره و پێدانی عومری سەد ساڵەم.

(٣) سورمه: کل ماددەیەکی ورده ئافرەتان بۆ جوانی له چاویان دەکەن، غوبـار: تـۆز، خوبـان: چاك: مەقدە: گەرانەوه له سەفەر.
واته ماوەیەکه چاوەڕوانی تۆز و گەردی سورمەم که لەلایەن چاکانەوه بۆم دێت ئەوەش بـه ئومێدی شەوی میعراج و گەڕانەوەت له سەفەردا.

(٤) وەفات هێنده زۆره لەسەرتاپای باڵا تەوقی داوه منیش بەخۆم دەگوت من وەکو قـومری وا بەسەر بەژن و باڵای بەرزی تۆوه، بەڵام لەبەر تەنگه نەفەسـی بەداخـەوه هەرچـی پـەڕوباڵم هەیه هەموو تیاچوو.

بــە حــوکمی خۆتــە ئیمــزا بــۆ مولاقــاتی شــەرەفیابی
لــە هــەر لایــی دەفــەرمووی حــازر و موشــتاقی بــالأتم[١]
لــە خزمــت خــان و ســەرهەنگدا ســەلامم فــەوجی ســەربازە
دوعــا: سـلطان و یاوەرمــە لــە بــوو ســەرتیپی ئــەقوالم[٢]

(١) مولاقات: بەیەکگەیشتن، موشتاق: پەرۆش.
خۆت بڕیار بدە ئیمزای بە دەستی خۆتـە بـۆ بەیەکگەیشتنی هـەتا بەدیدارت بەختـەوەر و موشرەف بم، من ئامادەم لە هەموو لایەك و شوێنێك من هەردەم پەرۆشی بەژن و بالاتم.
(٢) سەرهەنگ: پلەیەکی سەربازییە، ئەقوال: کۆی قول: گوتن.
واتە من لە خزمەت سەرتیپ و سەرکردەدا گەورەدا سەلا و ڕێزم هەروەکو ئەوەیە سەربازێك بۆ سەرکردەکەی دەیکات، منیش هەروەکو ئەو سەربازەم، هەروەها منیش دوعا دەکەم کە سوڵتانی بالا دەست هاودەم و یاوەر بێت بۆ سەرتیپی قسەکانم کە گوێی لێ بگیرێ بـەڵکو جارێك ئەو دوعایەم قوڵ دەبێت.

لـە ئـەم عیـدە بەعیـدم مـن لـە دیـداری ڕەفیقـانم
خـوا سـاتۆ قـەریبم کـەی لـە خـوانی وەسـلی یـارانم[1]
لـەلایی عوشـرەت و شـادی لـەلایی گـەردەن ئـازادی
ئـەمن کەوتوومـە نیـو داوی حـەریقی نـاری هیجـرانم[2]
سـەرم قوربانـت ئـەی سـاقی کـە تـۆ سـادەی وەرە سـادەی
فـداتم دەسـت و بردێکـە ئەجـەل نـەك بـێ بـەمیوانم[3]
دڵـم کەوتۆتـە ظلمـات و دەڵێ پـێم خۆشـە تـاریکی
بـە تـاریکی سـەری زولفـت ئومێـدم مـاوە وابـزانم[4]

---

(١) عید: جەژن، بەعید: دوور، قەریب: نزیك، خوان: سفرە.
واتە لەم جەژنەدا من گەلێك دوورم لە دیتن و چاوپێکەوتنی دۆست و یاران و خۆشەویستان ئەی خوایە دوعا دەکەم ئەگەرچی دوورم لە ڕەفیقان بەڵام لێت دەپاڕێمەوە کە نزیکم بکەیەوە لەسەر سفرەی خوانی بەیەکگەیشتنی یارانم.
(٢) عوشرەت: ژیانی خۆشی، برادەرایەتی: هیجران دوور لە دۆست و برادەران.
واتە لەلایەن ئەم جەژن و خۆشی و شادییە لەگەڵ دۆستان و برادەران لەلایەکی دیکە ئەم دۆست و برادەر و خۆشەویستانە گەردەن ئازادی لە یەکتری دەکەن، منیش وتومەتە نێوداوی سوتانی ناو ئاگری لێك جودابوونەوەی برادەرەکانم لێم.
(٣) ساقی: مەیگێڕ، سادەی: سادە و ساکار، سادەی: سازووکە.
واتە سەر و ماڵ و گیانم بە قوربانت بێت ئەی مەی گێڕ کە تۆ هێندە سادە و ساکاری وەرە زووکە و فریام کەوە بە قوربان هەتا زووە دەست و برد و پەلە بکە نەوەکو ئەجەل ببێتە میوان، چونکە ئەجەل سات و کاتی نییە هەر کاتێك بێت دێت لە نێوان سادەی و سادەی جیناسی لێکچوو هەیە.
(٤) دڵم کەوتۆتە نێو تاریکایی دەڵێ ئەو تاریکایکایەم گەلێك پێ خۆشە، چونکە هۆی ئەو تاریکیە زولفە ڕەشەکانتە بەسەر ڕووت هاتۆتە خوارەوە تاریکایی هێناوە کەواتە هێشتا زولفەکانت ڕەشە و بە هۆی زوڵفی ڕەشتەوە منیش ئومێدم هەر بە تۆ ماوە.

خــوا عـــومرت بـــدا بـــاقی وەرە ســـاقی بـــدە راقـــی
کــە تــۆ هــەمرازمی مــەی بێنــە تــۆ دەرمــانی دەردانم[١]
هــەتا کفــری ســەری زولفــت ببیــنم وا لــە نێــو کفــرانم
کــە دیــتم شمعــی روخســارت دەڵــێم ئۆخــەی موســڵمانم[٢]
بــە رەنگــی ئەشکی خــوێنینم کــە روو ســورم لــە قــاپی هــەق
لــە فــەیزی تۆوەیــە ســاقی بــە جۆشــە تــاوی گریــانم[٣]
بـــە خوێنـــاوی دڵـــی زارم وەرە کـــاکۆل حـــەنایی کـــە
مــەڵێ راوەســتە تــا قوربــان لــە عیــدانیا بــە قوربــانم[٤]

---

(١) هەمزار: هاودەم.
واتە ئەگەر عومر بمێنێ و خوا تەمەنم درێژ بکات دەڵێم ئەی مەی گێڕ وەرە راحەت بدە نێو دڵەکان کە تۆش هاودەم بیت دەی ساقی مەی بهێنە چونکە تۆ دەرمانی هەموو دەردەکانی و شیفای دەردەکان بە دەستی تۆیە.

(٢) شەمع: چرا، روخسار: روو.
واتە زولفەکانت رەشە ئەوە بۆ من کفرە کاتێك زولفەکانت دێتە سەر روخسارت رەش هەڵبگەرێت دیارە رەشایەتی واتە تاریکیش کوفرە بۆ من، هەرکاتێکیش زولفەکانت لادەدەی رەشایەتی نامێنێ روخسارت وەکو چرا دەدرەوشێتەوە کاتێك ئەو روخسارەت دەبینم و کوفر و تاریکی نامێنێ روناکی ئیسلام دەردەکەوێ و منیش دەڵێم ئۆخەی ئیسلام.

(٣) ئەشك: فرمێسك، قاپی حەق: خوا، فەیز: بەهرە، بەجۆش: بەخوڕ.
واتە ئەو فرمێسکانەی لە چاوم دێتە خوارەوە کە رەنگی سور هەڵگەڕاوە دیارە فرمێسکی پەشیمانییە من سەر بەرز روو سورم لەبەر دەرگای خوای باڵا دەست، لەبەهرە و بەرەکەتی تۆوەیە ساقی کە ئێستا زۆر بە جۆش و خرۆشمە تاوی گریانم.

(٤) زار: بریندار، کاکول: پرچ، حەنایی: خەناوی، عیدانا: جەژنەکان.
واتە دڵم زامدارە و خوێنی لێ دێ، تۆش پێویست بەوە ناکات خەنە بێنی و پرچت لە خەنە بگری وەرە بە خوێنی دڵی زامدارم کە خوێنی لێ دەتکێ پرچت خەناوی بکە.

لــــە نێـــو ئاتەشـــگدەی عەمـــدا کـــەبابی دڵ بـــرژا
شـــەراب بێنـــە بـــە پێوانـــە تـــەواوە عهـــد و پـــەیمانم[1]
شـوکر وەسـلم هەیـە ئـەمڕۆ لەگـەڵ پـەیکان وتیغـی تـۆ
کـە کوشـتەی تـیری موژگـانم کـە چـاکە تیـغ حرمـان[2]
وت دانـــەی خـــەیاڵت بنێـــرە نیـــو داوی زولفیـــنم
ئەگـــەر دەیکـــەم پەرێشـــانم ئەگـــەر نەیکـــەم پەشـیمان[3]
سـەفی تـابوری موژگانـت لـە قلعـەی دڵ کـە جـێگیر بـوو
هـــەتیوی دل نـــەما جێگـــەی لـــەبۆ کـــوێ رۆیـــی نـــازانم[4]

---

(۱) ئاتەشگەدە: ئاگردان، عەهد: پەیمان.
غەم دەور داوم وەکو ئاگردانی لێهاتووە دڵیش لە نێو ئەو ئاگردانەیە و وەکو کەباب وا تێدا دەبرژێ واتە دڵ کەباب و غـەمیش ئـاگردان و دەیـبرژێنی کەواتـە مـەی بهێنـە بـە حسـاب و پێوانە چونکە من هەر لەسەر عەهد و پەیمانی خۆمم.
(۲) وەسل: گەیشتن، پەیکان: تیر، حرمانی: نا ئومێدی، تیغ: شمشێر.
سوپاس ئەمڕۆ بە یەکگەیشتنم هەیە لەگـەڵ تـیر و شمشـێری مـووی برژانگـەکانی تـۆ کـە هێندە تیژە و دەیهاوێی دەم پێکی و دەدەمکوژێ ئەوەش دەبێتە جێگای نائومێدی.
(۳) وتت خەیاڵت بنێـرە نێـو داوی زولفـەکانم منـیش سەرسـام و سـەرگەردانم و نـازانم چ بکـەم چونکە هـەر کاتێك خـەیاڵم دەنێـرم پەرێشـان دەبم چـونکە زولفـەکانت هـەروەکو داو وایـە کەسێکی تێ بکەوێ دەیگرێ و دەربازی نابێت، وە ئەگەر بە قسەت ناکەم ئەوە پەشـیمانی بەدواوەیە.
(٤) سەف: ڕێز، تابور: سوپا و لەشکر، قلعە: قەڵا
واتە سوپا و لەشکری مووی برژانگەکانت وەها ڕێزیان بەستوە لـە نێـو قـەڵای دڵدا خۆیـان جێگیر کردووە، دڵیش وەکو منداڵێکی هەتیو جێگە و ڕێگای نەماوە نازانم بۆ کوێ چووە!

حەریقی تەرکی یار ناکەم سەرم ببرن ئەگەر فرضا
نیە باکم لەبەر تەعنەی موریدی پیری رەندانم[1]

(١) تەعنە: قسە و قسەلۆك، مورید: سۆفی، رەند: پیاوە قسەخۆش و مەرد
واتە(حەریقی) من هەرگیز ناتوانم تەرکی یار بکەم دەستی لێ هەلبگرم ئەگەر بێتو بۆ نموونە سەریشم ببڕن، هیچ باکیشم نییە لە قسە و قسەلۆکی خەلکی هەرچ دەلێن با بلێن و گوێم لێ نییە چونکە من پیاو سۆفی پیاوی مەرد و قسەخۆش و رووخۆشم.

بەشــی ناســینی نامــەردی لــە کــەس دا مــەردی نــابینم
لــەلای کــە ڕوو گــەرمی نــەبێ دڵ ســەردی نــابینم[١]
چە ڕوو سپییەك بـە ڕوو سـوری لـە بۆتـەی امتحـان دەرچـوو
درۆ ناکــەم بــە وجهــی راســتی ڕوو زەردی نــابینم[٢]
لە کەند و ڕەندی عالەم قـەت مەپرسـە گـەر خـیرد مەنـدی
خــودا هــەڵناگرێ ڕەنــدم نــەدیوە کەنــدی نــابینم[٣]
لــە کــەس وردیــم نــەدیوە تــا درشــتی پــێ نمایــان بــێ
کەســێ بــرویش دەکــا و لافی دەقیقــە وردی نــابینم[٤]

---

(١)ئەو کەسانەی یەکتر دەناسن و چاکە و پیاوەتیان لەلا دا نییە کەسانی نامەردن چونکە شتی چاکەیان لـێ ناوەشـێتەوە بۆیـە هەرچـی سیفاتی مـەردی هەیـە تێیانـدا نـابینم وە هـەر کەسێکیش کە ڕووی گەرم و خۆش لەگەڵ خەڵکیدا دیسان دل ساردییان تێدا نابینم.

(٢)دیارە دیوتانە کە چ کەسێکی ڕوو سپی بە ڕوو سوری لە تاقیکردنەوە دەرچووە منیش هـیچ کاتێك درۆم بە زماندا نەهاتووە و بەرووی راستیشدا هیچ ڕوو زەردییـەك نـابینم ئـەوەش لـە سایەی ڕاستگۆیمدا.

(٣)کەندو: ئەو شوێنەی جاران ئاردی تێدا هەڵدەگیرا، ڕەند: زیـرەك، خیرومەنـد: دانـا و زانـا، کوند: کوندەبوو هێمای شوم و نەگبەتییە.
ئەگەر تۆ کەسێکی دانا و تێگەیشتووی بە هیچ شـێوەیەك کـە کەنـدو زیرەکـی و لێهـاتوویی خەڵك مەپرسە و سەری خۆت پێـوە تـاڵ مەکـە، مـرۆڤیش قسـەیەك بـۆ خـوا بکـات کەسـی زیرەك و ئاقڵم نەدیووە کوندە بە بۆش نابینم.

(٤) وردی: دیقەت، شتی بچووك، درشت: گەورە، شتی پێشان دراو لە هیچ کەس شـتی بچـووکم نەدیوە هەتا شتی گەورەی پێوە بنێم کەسانی ئـەوتۆ هەیـە لاف و گـەزانی دەقیقەیـەك لـێ دەدا کەچی شتی بە دیقەتی تێدا نابینم. لە نێوان هەردوو ورد جیناسی تەواو هەیە.

گەلێ کەس دەستی چا دەڕوا وەکو چا ئابروی ڕۆیی
دەڵێ بۆ دین وەکو دنیا بە دەست بردی نابینم[١]
دەڵێ بۆ دین وەکو دنیا بەدەستو بردی نابینم[٢]
ئەوەی عارف بێ ئەیزانی ئەمن چم گوتووە لام باشە
ئەڵێم زاهیر بەدارچی ئەمن وەک بابەرد نابینم
(حەریق) دەردی گرانە حەیفە هیچ هاودەرێ نابینم[٣]

---

(١)چا= باش، چا، چایە شلەیەکە دەخورێتەوە، ، ئابروو= حەیا، دەست و برد= چستو چالاك زۆران کەس هەیە دەستی باش دەڕا ئیشی بێ دەکرێت بەڵام ئەو کەسانە ئابرویان ڕۆیشتووە هەروەکو چا، هەر ئەو کەسانە هێندە ب ۆدنیا چوستو چالاکنو بۆ دنیا هەوڵ دەدەن بۆ دین وانین بەپێچەوانەوە سستو تەمبەڵن.

(٢) عارف= پیاوی خواناس و دانا، زاهید= ئەو کەسەی تەرکی دنیا دەکات= سۆفی ئەوکەسەی زاناو دانا خواناس بێت باش دەزانێ من چم گوتووە، ئەوەی گوتوومە ئەوەم لام باشە بۆیە دەڵێم زاهد تۆ بەدارابچی منیش بەردنابینم.

(٣) حەریق دەردی گرنە دەردی بێ هاودەردیە واتە کەسێك هاودەردی من بێت زۆر هەوڵم دا گەڕام بۆ ئەوەی هاودەری خۆم بدۆزمەوە بەڵام سەدحەیفو مخابن هیچ هاودەرێك نابینم.

بــە قوربانــت بم ئــەی ســاقی بــدە پــێم راحــەتی روحــم
بــــەبێ ئـــاوی حـــەیاتی تـــۆ جگـــەر ســـوتاو و بـــرژاوم[١]
بـە شـەوقی شەوچـرای کولمـت فریـوت دا کـە مـورغی دڵ
بــە شــێوەی زولفـــت زانــیم کـــە مـــن گـــیرۆدەی داوم[٢]
کە دیتم شـەمعی  روخسـارت بـە پەروانـەی دلـی خـۆت ووت
لەناوچـەوانی خـۆم نووسـیوە هـەر بـەو شـەمعە سـووتاوم[٣]
تەماشـای چـاوەکەم کـردی بـرۆت فـەرمووی ئـەمن تـاقم
بــە شـــۆخی زولفـــی لاولاوت دەیـــەژێ هـــەر ئـــەمن لاوم[٤]

---

(١) راحە: ئیسراحەت، روح: گیان، ئاوی حەیات: ئاوی نەمری.
ئەی ساقی بە قوربانت  بم هەستە هەتا زووە پێم بدە ئیسراحەتی گیانم کە جامێك مەیە، چونکە تۆ بۆ من وەکو ئاوی نەمری وایت هەر کەسێك لە سەرچاوەی ئاوی ژیانی تۆ بخواتەوە تام و چێژی مردن ناکات، بەڵام هەر کاتێك تۆ لێم دوور بیت ئەوە جگەر دەسوتێ و دەبرژێت.
(٢) مورغ: باڵندە.
چرای کولمت هێندە بە شەوق  بوو کاریگەرییەکی زۆر هەبوو لەسەر دڵ و دەروون، ئەو شەوقە وای کرد باڵندەی دڵ فریو بدرێت، پاشان بە شێوەی جوانی زولفەکەت  هەر زوو زانیم و هەستم کرد کە من کەوتوومەتە ناو داو و گیرۆدە بویمە.
(٣) شەمع: مۆم چرا، روخسار: روو، پەروانە: پەپولە.
هەر کاتێك  چرای رووی تۆم بینی بە پەپولەی دڵی خۆت گوت تازە حاڵی تۆ هەر سووتان ولەناوچوونە بەهۆی ئەو چرایەی دەدرەوشێتەوە، پەپولە عەشقی چرایە هەر کاتێك چرا دەبینێت بە دوایدا دەسورێتەوە و لێی نزیك دەبێتەوە هەتا باڵەکانی لە چراکە دەدات و پەروباڵی دەسووتێنێت شاعیر پەروانە و رووی یاریش چرا.
(٤) دەیەژێ: دەڵێ، شۆخی: سوحبەت.
ئەو کاتەی تەماشای چاوەکانم کردی برۆکانت کە لەسەر چاوتەوەن پاسەوانی دەکەن فەرموویان ئەمن وەکو سایە و سێبەری چاوم هەر بە سوحبەت بە زولفە لاولاویەکەش دەڵێت هەر من بە تەنها  لاوی شۆخ و شەنگم.

ئــەڵێن وا جــەژنی نــەورۆزە دڵــم پــڕ ئاتــەش و ســۆزە
وەرە بــۆ جەژنــە بــدەم روحــم لەبــەر مــاوم لەســەر چــاوم[1]

وەرە سەرچـــاوەی چـــاوم، دەڵێـــی دەریـــای عەممانـــە
تەماشـــی ئەشـــکی گولنـــارم لـــە ســـایەی چـــاوم خوێنـــاوە[2]

هەموو کەس مەستی بادە و کەیف و شـەوق و بـەزمی جاناتـە
بــە تــەنیا هــەر ئــەمن ئــەمڕۆ لــە خــاکی میحنــەتا مــاوم[3]

نـــەما ئـــاوی بـــەقا بـــادی فـــەنا خـــاکی بـــەباد داوم
کــە یــارم ئاتەشـــی دووری لــە پووشـــی جەســتە بــەرداوم[4]

---

(١) ئاتەش: ئاگر
خەڵکی دەڵێن وا جەژنی نەورۆزە، لەو جەژنەشدا دڵ و دەروونم پڕ لە ئاگر و سۆزە جا کەوایە وەرە بۆ لام و بەو بۆنەیەوە جەژنە پیرۆزەم لێ بکە هەتا منیش لەبڕی ئەو جەژنانەیە روحم بدەم بە قوربانی جەژنانەت.

(٢) ئەشك: فرمێسك، گوڵ نار: گوڵی رەنگی سور گوڵی لە رەنگی ئاگر.
وەرە سەر کانی و کانیاوی چاوم هێندەی فرمێسك لێ دێ هەردەڵێی دەریای عەمانە، وەرە تەماشای فرمێسکی چاوەکانم بکە رەنگی هەر دەڵێی رەنگی ئاگرە وەها سور بووە ئەوەش لە سایەی ئەوەی کە چاوم خوێناوی لێ دێ بەهۆی خوێنەکە فرمێسکەکانم سور بووە.

(٣) مەست: سەرخۆش، بادە: مەی، جان: گیان.
ئەمڕۆ هەموو شاد و سەرخۆشی شەرابن و کەیف خۆش بە زەوق و شەوق لەگەڵ برادەران گیانی بە گیانی خەریکی بەزم رەزمن بەڵام ئەمڕۆ بە تەنها من ماومەتەوە لە خاکی ناخۆشی بێ کەسی دوورم لە بەزم و شەوقی سەرخۆشان.

(٤) بەقا: نەمری مانەوە، بادی فەنا: بای لەناوچوون و باد، پووش: درك و داڵ و پوش و پەڵاش، جەستە: لەش.
نەما ئاوی حەیات و مانەوەی هەتا هەتایی و با لەناوچوونیش هات خاکی بەرباد کرد و هەموو بە فیڕۆدا و لەناو چوو ئەویش ئەو کاتە بوو کە یار لێم دوور کەوتۆتەوە ئاگری لە

تەماشــی چــاوی نێرگــز کــە بــە مەســتوری چــە مــەخمورم
تەماشـــای پێکـــەنینی گـــوڵ بـــە ئـــەحواڵی پەشـــێواوم[١]
دیـــارە ســـاقی بـــێ بـــاقی نیـــە مـــەیلی بـــە دڵـــداری
ئـــەڵێم هـــا نەقـــدی جـــان و دڵ ئـــەڵێ لاچـــۆ لەبـــەر چـــاوم[٢]
دەوای هیجرانـــی گـــوڵ ئـــەی دڵ لـــە شـــێخ شـــاباز تەمـــەنی کـــە
بڵـــێ: ئـــەمرۆ بـــە ناحـــەق نەونـــەمامی جەرگـــە پـــێ کـــاوم[٣]
حـــەقم بســـتێنە ئـــەی نـــەخلی مـــوراد و ســـەروی ئـــازادم
وەکـــو عـــارەب دەخیلـــت بم زەلیـــل و زار و دامـــاوم[٤]

---

هەرچی پوش و پەلاشی جەستەم بەرداوە یاخود چۆن ئاگرێك دێت بە ئاسانی پوش و پەلاش دەسووتێنێ ئەویش بەهۆی دووری ئاگر لە جەستەم بەردەدات.

(١) نێرگز: گوڵێکی سپی بۆن خۆشە لە ئەدەبی کلاسیکی بە مانای چاوی جوانی یار دێت، مەستور: داپۆشراو، مەخمور: مەست و سەرخۆش.

وەرە تەماشای چاوە مەست و جوانەکانی یار بکە کە چۆن پۆشتەیە و داپۆشراوە مەست و سەرخۆشە هەمدیسان وەرە تەماشای پێکەنینی گوڵ بکە کە چۆن بە پێکەنینی ماڵ و حاڵم دەشێوێنێ.

(٢) دیارە مەی گێڕ هەتا سەرنابێ و نامێنێ ئەو مەیلە کە هەیەتی بەرامبەر بە دڵداری ئەویش هەتاسەر نییە، بۆیە منیش دەڵێم ها ئەوە گیان و دڵم تەسلیمت بکەم بەڵام ئەو لە جیاتی ئەوەی لێم وەربگرێ پێم دەڵێت لاچۆ لەبەر چاوم.

(٣) دەوا: دەرمان، هیجران: لێك دابڕانی دۆست و خۆشەویستان، تەمەنی: داوا بکە.

واتە هەستە دەرمانی دەردی لێك جودا بوونەوەی دۆست و خۆشەویستان لە شێخ شاباز داوا بکە و پێی بڵێ ئەمرۆ بەناهەق جەرگی تازە پێگەیشتووی پێکاوم و لە ناوی برد.

(٤) نەخلی موراد: هیوا و ئارەزوو خۆش

وەکو عەرەب دەست و دامێنت بم من زەلیل و بریندار و داماو و بێ کەسم داوات لێ دەکەم کە هەقم بستێنی ئەی ئەو کەسەی وەکو درەخت سەربەرز و ئازادی چونکەتۆ جێگای مەبەست و هیوا و ئارەزوو خۆشی منی.

**احـــەریقای نـــاری هیجـــران و غـــەریقی ئەشـــکی حیرمـــانم**
**لـــە خـــاك و بـــاد و عالـــەم دا ئەنیســـی ئـــاگر و ئـــاوم[1]**

(١) نار: ئاگر، ئەنیس: هاودەم
حەریق بەهۆی دووری جیابوونەوەی یـار لـەناو ئـاگرە و نقـومی فرمێسـکی نائومێـدی بـووە بۆیە لە خاك و ئاو هەوای جیهاندا من هاودەم و هاونشینی ئاگر و ئاو.

# پیتی نون

ئـــەی تۆبـــە لـــە دەس رۆژی فـــراق و شـــەوی هیجـــران
وەی روو لـــە هـــەرا و کەشمـــە کەشـــی ســـاعتی حیرمـــان
هـــەر خۆزگـــە بـــە چـــاوم لـــە فراقـــی غـــەمی یـــارم
هـــەر چـــاوەنوارم لـــە نیگـــای دیـــدە غـــزالان[١]
جـــاران بـــۆ کـــەمالم دەچـــوو بـــاقی بـــوو کـــەمالم
ئـــەم جـــارە بـــە جـــاری ســـەرومالم چـــوو بـــە تـــالان[٢]
تـــا ســـنبلی زولفـــت بـــووە پـــەرژینی گـــوڵی رووت
نـــەم دیـــوە لـــە دەرویشـــەوە عیشـــە و خـــەت خـــالان[٣]

---

(١) فراق: جیابوونەوەی دوو دڵدار لە یەکتری، هیجران: دوور لـە خۆشەویستان، کەشمەکەش: گۆتە گۆت.
تۆبەو داد و بێ داد لە دەست ئەو رۆژەی کە لەگەڵ دڵدارەکەم جیا دەبمەوە هەروەها داد و بێ داد لە دەست ئەو شەوەی لێك دوور دەکەوینەوە کەواتە هەردەم ئاه و ناڵەیەتی بەشەو بەرۆژ لە دەست دووری یار هەروەها هاوار لە دەست ئەو شوێنەی کە هـەرا و گۆتـە گۆت و حەوت هەشتی تێدایە لە دەست نائومێدی کە چ تاڵ و خۆشە.
(٢) غزالان: کۆی (غزال)ە مامز
سەد خۆزگـە بـە پـار دەخـوازم (سـاڵ بـە سـاڵ خۆزگـە بـە پـار) چـونکە سـاڵی پـار غـەمم نـەدەخوارد بـەلام ئێسـتا غـەم سـەرتاپای دڵ و دەوونـی داگرتـووم ئـەویش لـە غـەمی جیابوونەوەی یارم هەر چاوەڕوانم لە وێنە و بینینی چاوی جوانی یـار بـەڵکو خـوا دەکـات بەدیداری شاد ببم.
(٣) کەمال: تەواو، باقی: ماوە.
جارانی زوو پێشو لە هەوڵی ئـەودا بـووم بـۆ تـەواوکردنی بچـم چـونکە هیشـتا زۆرم مـابووم بگەم بە کەمال و خەریکی تەواوکردنی بووم، بەلام ئێستا بـە پێچـەوانەوەی جـاران خـەت و خاڵ مەبەست چاو برۆی یارە.

بــــۆ ســــەبزەی نـــەوخێز خــــەتی لالـــــە روخــــانم
هــــەوری خەفـــــەتم حــــازرە بـــــۆ دیــــدەی گریــــان[١].
غونچــــەی ئەمــــەلم چـــونکە نەپشــــکوتووە ئــــەم ســــاڵ
بلبــــل بـــەدڵم دەبێــــژی کـــە ســـەد خۆزگـــە بەســــالان[٢].
بـــۆ تـــاری ســـەری زولـــف و منـــیش ئەشـــکی بەحەســـرەت
خــــۆش بەیـــــەکا رشـــــتەی دام و دانـــــەو مــــەرجان[٣].

---

زولفەکانت هەروەکو گوڵە گەنم بۆتە پەرژین لێ ناگەڕێت رووت ببینم کە دەڵێ گوڵە، جا لەوکاتەوە کە زولفت بۆتە پەرژین دوور بە دووریش خۆشی و لەزەتم وەرگرتووە بە بینینی چاو و برۆکانت.

(١) سەبزە: گژوگیا مەبەست ئەو موویە لەسەر رووی لاوان دێت، نەوخێز: گەنج تازە پێگەیشتوو، رووخان: روو.
ئەو مووە تازانەی کە لەرووی گەنجانی تازە پێگەیشتوو دێت هەروەکو لالەو چرا وایە لەروویان دەدرەوشێتەوەو رووناکی دەبەخشێت بە دەوروبەر منیش هەردەم لەغەم و خەفەتدام دەگریم و چاوەکانم ئامادەیە فرمێسکییان لێ بڕژێت هەروەکو چۆن هەور بارانی لێ دێت چاوەکانی منیش وەکو باران فرمێسکییان لێ دێت.

(٢) غونچە: گوڵی تازە پێگەیشتوو، ئەمەل: هیوا ئومێد، دەبێژێ: دەڵێ
هێشتا هیواو ئاواتەکانم پێنەگەیشتوون هەروەکو چۆن خونچە دەمی نەکردبێتەوە بۆ ژیان منیش هێشتا هیوام بۆ ژیان نەپشکوتووە ئەمساڵ دیارە هێشتا زووە بولبولیش بە دەنگ و ئاوازی خۆی پێم دەڵێت سەد خۆزگە بە سالانی رابردوو.

(٣) تار: رەش، ئەشك: فرمێسك، حەسرەت: ئاخ هەڵکێشان، رشتە: رستە، دام: داو، مەرجان: بەردێکی سورە لەناو دەریا هەیەو بەنرخە.
مووی زوڵفەکانی رەشە کاتێك دەبینم بەداخ و خەفەتەوە فرمێسکی بۆ هەڵدەرێژم زۆر بەئاسانی و بەخۆشی رستەی هەڵخستووە بەمووەکانی زوڵفی دانە دانەی مەرجانی تێخستووە یاخود دانەی مەرجانی لەمووەکانی خستووە و کردوویە بە تەزبیح.

قـــەترەی ئـــارەقی شـــینم بـــەرگی گـــوڵی رووت بـــوو
ئـــەم زانـــی کـــە مەرجانـــە لەســـەر لـــەعلی بەدخشـــان[١].

تـــا رشـــتەی زولفـــت بـــووە دامـــی دڵـــی مـــەیلم
مـــەجنونی دووجـــەلیم لەهـــەموو قـــەومی هەراســـان[٢].

جـــەرگم بـــەدەمی تیغـــی بـــرۆت بـــبڕە بەشـــەرتێ
بـــدوری بەتـــەلی زولـــف و بـــەتای ســـوژنی موژگـــان[٣].

لـــەو چـــاکە کـــەوا دیومـــە کـــەوا چـــاکی دوو گیرفـــان
گیرفـــانی دەروونم بەخـــەیال پڕبـــوو لـــەعیرفان[٤].

---

(١) قەترە: دڵۆپ، ئارەقی شین: ئارەقی ماندووبوون و هیلاکی، لەعل: بەردێکی بەنرخە وەکو یاقوت، بەدخشان: ناوچەیەکە لە تورکمانستان بە لەعل بەناوبانگە.
هەر دڵۆپێکی ئارەقی هیلاك و ماندووبوونم دەبووە بەرگێك بۆ ئەو گوڵانەی کەلەسەر رووت پەیدا دەبوو، دەمزانی هەر دانە مەرجانێکیش کەلەسەر لەعل کە بەردێکی سوورو گران بەهایە وەکو لەعلەکانی وڵاتی بەدخشان دەچێت لەجوان و گرانیدا.
(٢) مەیل: حەز، مەجنون: (قەیسی عامری حەزی لە لەیلای ئامۆزای کردووە، بەڵام لەبەر هەرهۆیەك بێت پێنەگەیشتووە، بەکێو و بیابان کەوتووە لەتاو خۆشەویستەکەی) هەراسان: ترسان، توڕەبوون.
هەتا رستەو تەنافی مووی زوڵفەکانت ببێتە داوو تەلە بۆمن ئەوە هەردەم دڵم حەزی لەو تاڵە موانەی زوڵفتە هەروەکو مەجنون (قەیسی عامری) منیش گەر پێت نەگەم تووڕە دەبم لەهەموو دۆستان و لێیان دوور دەکەومەوە.
(٣) سوژن: دەرزی گەورە شتی ئەستووری پێ دەدروێتەوە وەکو گوش، موژگان: برژانگ، وەرە جەرگم بەنووکی تیژی برۆت ببڕە بەڵام بەمەرجێك جەرگم بدوریەوە بەتاڵە مووەکانی زوڵفت و یان بەسوژنی برژانگەکان.
(٤) عرفان: خواناسی، ئاگاداربوون لە وردەکانی نهێنییەکانی شت.
لەوشتە چاك و باشانەی کەوا من دیتومە باشی و چاکی خاوەن دوو گیرفانە یەکێکیان گیرفانی دەروونمە بەخەیاڵ ئەو گیرفانە پڕ بووە لە نهێنییەکان و وردەکارییەکانی خوداپەرستی.

دڵ بۆیـــە ســـــەودای بـــووە وە زوو لەخــــەتی تـــۆ
منـــاڵ بـــوو کـــە فێربـــو لەخــــەتی لەوحــــەی جانـــان[١].
تـــا ئایـــەتی حســـنی لەخــــەتی مصـــحفی رووت خوانـــد
صـــاحبە ســـــەودا و خەتــــە نـــاطق بـــوو بــــەقورئان[٢].
تەشــــــریح خـــــەیاڵی ملـــــك الاعظمـــي وجهـــــت
تەســـــویر بــــەبێ گـــۆی ذقنـــت نایەتـــــە ویجـــــدان[٣].

---

(١) سەودا: خۆشەویستی، ئالودەبوون، رەشایی، لەوحـە: هەرشـتی یـان گـەورەو لـووس شـتی لەسەر بنووسرێ یان لێی هەڵبواسرێ، جانان، جان گیان.
دڵ بۆیە هێندە بووە ئالوودەو خۆشەویستی تۆ هـەر زوو بـووە عەشـقی رووت چـونکە هـەر لەمنداڵیـدا فێرکرابـو لـە روو تـۆ لـێ راهـاتبو لەسـەر لەوحـەی دڵ و گیـان تێـڕابمێنێ خۆشەویستی فێرببێت.
(٢) ئایەت: نیشانە، حسنی: جوانی، خەتی مصـحف: خـەتی کتێـب: بـەمانای کتـێبی ئاسمـانی قورئان دێت، صاحبە: خاوەن، سەواد: فێربوون، ناگق: قسەزان.
نیشـانەی جـوانی ناسـکیت لەسـەر خـەتی کتێـب رووت خـۆی وا پێشـان داوە، ئاسـانی دەخوێندرێتەوە، خاوەنی ئەو کتێبە بۆ فێربوونی خەتەکانی نـاو ئـەو کتێبـە کـە قسـەکانی بەهەموو بەقورئانە.
ناطق بەقورئان دەبێت مەبەست پێغەمبەر (ﷺ) چونکە هـەموو کـارو کـردەوەو قسـەکانی هەموو وەکو قورئان بوو، یاخود هەرکەسێك سیفاتی قورئانی هەبێت .
(٣) تەشریح: پارچە پارچەکردن، فلك الاعظمـی: ئاسمـان، وجهـت: رووت، تەسـویر: وێنـەکردنی کەسێك یان درووست وێنەی کەسێك، ژقن: چەناگە.
رووت هەروەکو ئاسمانی گەورە وایە کە پارچە پارچەبووە بـۆ چـەند بەشـێك بـەڵام ناکرێـت وێنەی رووت بکێشرێت و درووست بکرێت بەبێ گۆنانی خڕت ئەوەش ویژدان قبـووڵی ناکـات وێنەی رووت بکێشرێت بەبێ گۆنای خڕت.

خاڵـــت لـــە روخـــت نقتەیـــە بـــۆ مەرکـــەزی عالـــەم
زوڵفـــی وەکـــو قـــەترەت بەکۆشـــش هاتنـــە جـــەولان[1].
بـــۆ مەتلـــەعی بـــورجی قەمـــەرو شەمســـی جـــەمالت
کەوتۆتـــە رەســـەد خانـــەی نیـــو چـــاه زنەخـــدان[2].
وەک مـــەنعی مـــنی کـــرد لـــە تـــەوافی حـــەرەمی رووت
ســـا رەبـــی لـــەئیمان بـــێ ســـەرداری لـــە ئیمـــان[3].
بـــازاڕی جـــەهل گـــەرم و هونـــەر ســـاردە رەواجـــی
عەســـری خەزفـــە حەیفـــە گەوهـــەر بێنینـــە مەیـــدان[4].

---

(١) خاڵ: نوقتەیەکی رەشە لەسەر پێستی مرۆڤدا هەیە، مەرکەزی عالەم: چەقی دنیا.
خـاڵی سـەر رووت وەکـو نوقتەیەکـە بـۆ چـەقی زەوی، زوڵفیشـت هـەروەکو قـەتران رەشـە خەڵکی بۆ سوڕانەوە بەدەوریا هەوڵ و کۆشش دەکەن.
دەبێت مەبەستی شاعیر ئەوەبێت خاڵی رەش کەعبەی پیرۆزبێت، کە کەوتونە چـەقی زەوی خەڵکیش هەوڵ و کۆشش دەکات بۆئەوەی بگەنە ئەو شوێنە و تەواف بەدەوردا بکەن.
(٢) مەتلەع: شوێنی هەڵاتنی مانگ و رۆژ، بـورج: یـەك لـەدوازدە بەشـەکەی ئاسمـان کـە زەوی بەدەوریدا دەسووڕێتەوە، هەرکاتێك زەوی یەکێکیانی بڕی مانگێك تـەواو دەبێـت، شـەمس: رۆژ، جەمال: جوان، رەسەد: کەمین شـوێنی خـۆ پـەنادانی کەسـێك بـۆ نێچـیرەکەی، چـاه: بیر–چاڵ، زنەخدان: چەناگە.
رووت هەروەکو مانگ و رۆژ جوان جا بۆ هەڵاتنی شێوەی جوانت لەنێو بورجەکانی ئاسماندا ئەو جوانییەت کەوتۆتە ناو کەمینی چاڵی چەناگەوە.
(٣) مەنع: قەدەغە، تەواف: سوڕانەوە.
هەروەکو چۆن قەدەغەی منیان کرد لە سـوڕانەوە بـەدەوری حـەرەمی رووی جوانیـت ئـەی خوایە ئیمانی نەبێ ئەوکەسە چونکە ئەوکەسەی گەورەو سەرداری ئیمانە.
(٤) جەهل: نەزانین، رەواج: برەوپێدان، عەسر: سەردەم.

هەریەک پەلی فرزەندی دەژی شیعری (حەریقی)
تۆ بۆچی لەکیس خۆتی ئەدەی موشتەری نادان[1].

---

بازاڕی نەزانین گەرم و گوڕە بەپێچەوانەوە بازاڕی هونەر ساردو کەساسە و برەوی نییە ئەمڕۆ سەردەمی لەناوچوونە بەداخەوە گەوهەرو شتی گران بەها بێتە مەیدانەوە.

(١) فرزەند: منداڵ، لەکیس خۆتی ئەدەی: لەدەست خۆتی ئەدەی، موشتەری: کڕیار.
هەریەکێك لەئێوە وەکو منداڵ دەژی لەگەڵ شیعرەکانی حەریقی وەکو ئەوەی پەروەردە بکرێت لەشیعری تەڕو باراوی حەریقی، جا کەوایە تۆ بۆ وا بەئاسانی لەدەست خۆتی دەدەی ئەی کڕیاری نەزان.

ئــــەم تاقمــــــە شـــــیرینە لـــــە مەکتـــــەب دیـــــارن
جــــــەلادی دڵــــــی عالــــــەم و ئاشــــــووبی دیــــــارن[١].
شـــــیرین ســــــەنەم و دولبــــــەرو فــــــەتان و عــــــەیارن
خــــاڵی لـــــە خەلــــەل جوملــــە وەکـــو نەقــــدی عــــەیارن[٢].
شــــۆخن هــــەموو شــــەنگن هــــەموو گــــوڵ ئاتەشــــی رەنگــــن
ئامــــــادەی جــــــەنگن هــــــەموو ســــــەیادی شــــــکارن[٣].
اهــــــو رەووش و مــــــەهوش و شــــــیرین حــــــەرەکاتن
ناســــــك بــــــەدەن و ســــــیم تــــــەن و لالــــــە عــــــەزارن[٤].

---

(١) تاقم: دەستە، جەلاد: ئەو کەسەی ئازارو ئەشکەنجەی خەڵك دەدات، ئاشوب: ئاژاوە.
ئەو دەستە جوان و قسە شیرینانە کە دەیانبینی لەمەکتەب فێری ئـەو خورەوشـتە بوینـەو جێگایان لەناو خەڵکدا دیـارە، هـەر ئەوانـە بونەتـە ئـازارو ئەشـکەنجە دەری دڵـی خـەڵکی ئاژاوە گێڕ کە ئەوانیش هەر دیارن لەناو خەڵکدا ئاژاوە دەنێنەوە.
(٢) سەنەم: بـت، فـەتان: جـوان و دڵـڕفێن، عـەیار: زۆرزان–زمـان لـووس، خـالی: بـۆش– بـێ عەیب، خەلەل: کەم و کوڕی، نەقد: جیاکردنەوەی شتی باش لەشتی خراپ.
هەر ئەو دەستەیە دەڵێی بتن بەمەبەست درووست کراون هێنـدە دولبـەرو جـوان و دڵـڕفێنن زۆرزان و قسـە شـیرینن لەهـەموو خەوشـێك بـێ عـەیبن واتـە بـەکورتی بەئاسـانی دەتـوانی لەکەسانی دیکە جیایان بکەیەوە.
(٣) ئاتەش: ئاگر، سەیاد: راوکەر.
هێندەن جوانن لە شۆخ و شەنگی هەموویان هەر دەڵێی گوڵن رەنگیان رەنگی ئاگرە هەموو کاتێکیش ئامادەن بۆ جەنگ هەردەڵێی راوکەرن خۆیان ئامادە کردووە بۆ راوی نێچیر.
(٤) اهو: ئاسك–مامز، مەهوش: رووی جوان وەکو مانگ، حەرەکە: جوولانەوە، بـەدەن: لـەش، سیم تەن: لەشی سپی و جوان وەکو زیو، لالە: گوڵاڵە.
ئەو دەستە جوانە وەکو مامز رێك و جوانن –روویـان هـەر دەڵێـی مـانگی چـواردە شـەوەیە لەجوانیدا هەرچی جموجۆڵ و جوولانـەوەیان زۆر شـیرینەو لـەش و لاریـان ناسـکەو سـپی و جوانە هەردەڵێی زیوە بۆن و بەرامەشیان وەکو گوڵی گوڵزار و گوڵاڵە سوورەیە.

گـــاهی دەبنـــە رەهزەنـــی ئیمـــان و دڵ و دیـــن
گـــاهی وەکـــو ســـوفی هـــەموو مایـــل بەکـــەنارن[1].
گـــاهی ئـــەنوێنن روخ و رروونـــاک ئەکـــەن رۆژ
گـــاهی بـــە دوو زوڵفـــینی ســـیا وەک شـــەوی تـــارن[2].
زوڵـــف و روخ و پەرچـــەم لەگـــەڵ ئەگریجـــە و کـــاکوڵ
ئیعلانـــــی حەربیانـــــە کەئیســـــلام و کوفـــــارن[3].
خـــاڵ و خـــەتی بـــێ حـــەد کـــە هـــەموو جومعەلەســـەرخۆ
وەک زەنگـــی لەگـــەڵ خـــورو وەکـــو زاغ و عـــەتارن[4].

---

(١) رەهزەن: چاو ساغ رێگا پێشاندەر، مایل: مەیل، کەنار: گۆشەگیر.
ئەوکاتەی دەبنە چاوساغ و رێگا پێشاندەری ئیمان و دڵ و دین هەندێك جاریش وەکو سۆفی لەگۆشەی خانەقا گۆشەگیر دەبن دوور دەکەونەوە لەخەڵکی.

(٢) زولفینی سیا: دوو زولفی رەش، شەوی تار: شەوی تاریك.
ئەوکاتانەی رووی جوانی پێشان دەدات دنیای رووناك دەکاتەوە وەکو رۆژو ئەوکاتانەش کە زولفە رەشەکانی دەهێنێتە سەر رووی تاریك دادێت و دەبێتە شەوی تاریك، رووی رووناك وەکو رۆژ زولفی رەش شەوە.

(٣) روخ: روو، پەرچەم: ئەو موانەی دێنە سەر نێوچەوان، کاکول: پرچ، ئیعلان: راگەیاندە، حەرب: شەڕ.
زوڵف و کاکول پەرچەم لەلایەك و لەلایەکی دیکە روو شەڕیان لەگەڵ یەك راگەیاندوون هەر دەڵێی سوپای ئیسلام لەلایەك و سوپای کافران لەلایەکی دیکەوە، رووی جوان وەکو رۆژ رووناکە سوپای ئیسلام پرچ و زولف رەشە هێمای کوفرە.

(٤) بێ حەد: بێ سنوور، جەمعە: کۆبوونەوە، لەسەرخەد: لەسەر روو، زاغ: قەلەڕەش، حور: حۆری، عەقار: کەرستەی ماڵ، شەراب، زەنگی: رەشی.
ئەو خاڵ و تازە مووانەی کەهەموو بەیەکەوە کۆبوونەتەوە لەسەر رووی وەکو ئەوەیە کە چۆن جیاوازی دەکرێت لەنێوان کەسێکی رەش لەگەڵ حۆریەك ئەوەش هەروەکو قەلەڕەش و شەڕابە زەنگ و قەلەڕەش رەشن کە جێگای کەلاوەیە حۆریش و شەڕابیش خۆراکی بەهشتییەکان.

کـــێ حـــەدی هەیـــە تـــالبی گـــەنجی روخیـــان بـــێ؟
یـــەک یـــەک کەهـــەموو ســـاحیبی زولفـــی وەکـــو مـــارن [١].
مومتـــازی جیهـــانن هـــەموو هـــەم مونتەخـــەبی شـــار
ئاغالـــــەر و بـــــەگزادەو ئەســـــتاف و کیبـــــارن [٢].
وەخـــتێ کـــە ئەکـــەن جلـــوە لەمەیـــدانی حوســـندا
وەک کبکـــــی خـــــەرامان وەکـــــو ئـــــاهوی تـــــەتارن [٣].
مـــــەوزون و لـــــەتیف و خـــــۆش خورشـــــیدو ســـــەعیدن
مـــــەتبوع و رەشـــــیدن بەئوســـــول و بـــــەویقارن [٤].

---

(١) حەد: توان بەشێوەی هەڕەشەکردن، تالب: داوا، زولفی وەکو مار: زوڵفی پێچاوپێچ.
کێ توانای هەیە کە داواکاری رووی جوانی گەنجان بێت کە هەرهەموویان یەکەیەکە کە تەماشایان بکەی خاوەنی جووتە زوڵفی پێچاوپێچن هەردەڵێی مارە خۆیان لول لول داوە.

(٢) مومتاز: چاک، مونتەخەب: هەڵبژاردە.
ئەو دەستەو تاقمە هەڵبژاردەی شارن لەجوانی و بەتوانایی و لێ هاتوویی هەربۆیە ئەوانە دەستەی هەرە چاکەکانی جیهانن، چ ئاغازادە بێت یاخود بەگزادە ئەوانە دەستەو پۆلی گەورەکانن.

(٣) جلوە: ئاشکراکردن لە ئەدەبی سوفیزم درەوشانەوەی نووری خوا لەناو دڵی خواناساندا، حوسن: جوانی، کبک قبج: کەو، خەرامان: رۆیشتن بەناز و لەنجەولار، ئاهوی تەتار: مامزی وڵاتی تەتەرستان.
هەرکاتێک ئەوانە خۆیان بەدیار دەخەن لەمەیدانی جوانیدا هەردەڵێی کەون کاتێک لەرۆیشتندا زۆر بەلەنجەولار دەرۆن یاخود دەڵێی مامزەکانی وڵاتی تەتەرستانن.

(٤) مەوزون: گران و سەنگین، لەتیف: نەرم و نیان، خورسەندو سەعید: کامەران و بەختیار، مەتبوع: پەیڕەوکراو، ویقار: هێمن و لەسەرخۆ.
ئەو دەستەیە لە رۆیشتندا هێندە گران و سەنگین و نەرم و لەسەرخۆن و کامەران و بەختیارن هەروەها پەیراوی کراوی پیاوی گەورەن گەلێک ئازاو بەئوسوڵ و هێمن و گەورەو لەسەرخۆن.

وەك موعجیزەی مستەفا واتە لەلای من
بەو لەعلی نمەك ریزە کەوا شەکر ئەبارن[1].
هەر ئەحمەد و مەحمودە خەیاڵی و شەو و رۆژم
لەم مەکتەبی روشدیە کەوا پڕ لەنیگارن[2].
هەرچەندە کە سووڵتانی جیهانن لەحوسندا
بۆ شبری رەقیبم حەسەن و حوسەینی هەژارن[3].
بەم هەیئەتی دەروێشییە رازیم و رەقیبان
دەستم لەیەخە ناکەنەوە چەندە شەڕرارن[4].

---

(١) موعجیزە: ئەوشتانەی لەدەسەڵاتی مرۆڤ بەدەرە جگە لە پێغەمبەران (سڵاوی خوایان لێ بێت) مستەفا: مەبەست پێغەمبەری ئیسلامە(ﷺ) لەعل: لێوی سورو جوان، نمەك: جوانی و ئێسك سووك.
هەروەکوموعجیزەی پێغەمبەرە(ﷺ) لای کە ئەوقسە شیرینانەی لەلێوی سورو جوانی دەبارێت چونکە قسە شیرینەکانی هەروەکو قسەی پێغەمبەر(ﷺ) جوان و شیرینە یاخود قسەکانی بەتەواوی هاوجووتە لەگەڵ قسەکانی پێغەمبەر(ﷺ).
(٢) ئەحمەد و محمود: مەبەست پێغەمبەرە(ﷺ) خەیاڵ: بیرکردنەوە، مەکتەبی روشدیە: قوتابخانەی سەرەتایی سەردەمی عوسمانییەکان، نیگار: وێنە.
بەشەو و بەرۆژ هەر بیرو هۆشم لەلای پێغەمبەرە(ﷺ) بیر لەهیچ شتێکی دیکە ناکەمەوە جگە لە ئەو لەمەکتەبی روشدیە کەجێگای فێربوونە پڕە لەوێنەی ئەو دەستەیە.
(٣) سووڵتانی جیهان: گەورەی جیهان، حوسن: جوانی، شبری: بکوژی حوسین کوڕی عەلی (خوای لێ رازی بێت) لەساڵی ٤١ کۆچی لەنزیك کوفەی عێراق، رەقیب: دوژمن حەسەن و حوسین کوڕی علی کوڕی ئەبی تالیب.
ئەو دەستە تازەیە گەورەو سەرداری جیهانن لەجوانیدا بەڵام بۆ شبری کە دوژمنمە چونکە بکوژی حوسینە وەکو ئەوان هەژارن.
(٤) هیئەت: شێوە، شەڕرار: شەڕانگێز.
هەرچۆنێك بێت من بەو شێوەی دەروێشیە کە ژیانی ساکارو سادەیە رازیم ئەی دوژمنەکان هێشتا دەستم لێ ناکەنەوەو وازم لێ ناهێنن ئەوانە چەندە کەسانی شەڕاوی و شەڕانگێزن.

عـــازز بـــوو لەســـەر عازریـــان زولفـــی پەرێشـــان
بـــێ عـــەینی ئـــەڵێی حـــاڵ و مـــەحاڵ و لـــەیل و نـــەهارن[١].
پەیوەســـــتە وەکـــــو دەســـــتە گـــــوڵی بـــــاغی جینـــــان
وەک غونچـــــەی نەشـــــوکفتەی نـــــەورۆزی بـــــەهارن[٢].
ئـــەما لەگـــەڵ ئـــەو حوســـنە نییـــە حوســـنی وەفایـــان
حـــــەیفێ کـــــە لەســـــەرنجی دڵـــــی عاشـــــقی زارن[٣].
پـــارەی جگـــەرم کـــردە کـــەباب و مـــەزە بۆیـــان
تادیومـــــە کـــــەوا ســـــاحێبی دووچـــــاوی خومـــــارن[٤].

---

(١) عازز: دەم و چاو و رووخسار، پەرێشان: شێواو، لەیل و نەهار: شەو و رۆژ.
ئەگەرچی زوڵفی شێواوی بووە رێگر لەسەر دەرخستنی رووخساری جوانی بەڵام لەگەڵ ئەوەش رووی سپی هەر دیاربوو جوان بوو، بێ چاوی بێت رووخساری جوانی بەدیار دەکەوێت دەڵێی رۆژە دەدرەوشێتەوە کاتێکیش زولفی دەبێتە رێگر رووخساری دادەپۆشێت تاریکی دادێت هەر دەڵێی شەوە.
(٢) جینان: بەهەشت.
جوانیو رووخساری یار پەیوەستە بەگوڵە جوانەکانی بەهەشت، بەڵام چ گوڵێك دەڵێی خونچەی نەپشکوفتووە هەروەکو خونچەکانی نەورۆزو بەهار.
(٣) زار: بێ هێز.
لەگەڵ ئەو جوانیانەی کە هەیەتی بەڵام سەد حەیف جوانی وەفای لەسەر دڵی عاشقان زۆر بێ هێزن گرانە لەسەر دڵیان.
(٤) چاوی خومار: چاوی مەست.
جەرگم پارچەپارچە کردووە بۆیان برژاندم و کردوومە کەباب و مەزە لەبەر دەمیانم دانا ئەوانەش خاوەنی دووچاوی مەستە چاو مەستیە سەرخۆش دەکا.

لــــەوحی دڵیـــان ســـادە لـــەمیهرو لەوەفایـــە
بـەمیهرو موحبـەت هـەموو بـێ شـەرت و قـەرارن[١] .
هەرچـەندە کـە بـێ تـالع و بەدبەختـە (حـەریقی)
ئەشـعار بەئەشـعار عەجـەب پڕلـە شـیعارن[٢] .

---

(١) پەڕەی دڵیان ساف و سادەیە پڕە لە میهرو وەفا بەڵام بەبێ میهرەبانی خۆشەویستی هەموو دەبێتە هۆی بێ شەرتی بێ قەراری.

(٢) تالیع: بەخت، بەدبەخت: بێ بەخت، ئەشعار بەئەشعار: دێربەدێر، شیعار: دروشم.
ئەگەرچی حەریق کەسێکی بێ بەخت و چارە رەشە بەڵام هۆنراوەکانی دێربەدێر هەموو جێگای سەرسوڕمانە کە پڕیەتی لەدروشمی چاك و پوختە.

مــــــاهی تەمامـــــــە، مـــــاهی تــــــەمامم نــــــەدیوە مـــــن
ئیشـــــی تەمامـــــە حـــــەیفی کـــــە جێگـــــەم نـــــەدیوە مـــــن[١].
هـــــەروەک بـــــەدری هـــــیلال لەبـــــەر جـــــەوری پەرچـــــەمی
چـــــاوی ئـــــەزانی، شـــــاهیدە قـــــەدەم چـــــەمیوە مـــــن[٢].
بـــــۆ رۆژی عـــــــازری وەکـــــــو رۆژت گـــــــوڵی کـــــــەرەم
شەمســـی جـــەمالت لەتەڵعـــەتی تـــۆم قـــەد نـــەدیوە مـــن[٣].
لـــــەعلی یـــــەمانی و حەلقـــــەی مـــــەرجانی یـــــا عەقـــــد
ئەشـــــک لەلالـــــەی مـــــەردەمی دیـــــدەم چـــــەکیوە مـــــن[٤].

---

(١) ماه: مانگ، تەمام: تەواو چواردەشەو.
یار دەڵێی مانگی چواردەشەو هێندە جوانەو دەدرەوشێتەوە ئەوە بۆ مانگێک دەچێت ئـەو مانگەم نەدیوە، چونکە مانگی تەواو ئیش و کارەکانی هێندە تەواو هەروەکو چۆن مانگ کە گەیشتە چواردەشەو تـەواو دەبێت ئیشـی ئـەویش تـەواو بـەڵام سـەد حـەیف و مخـابن کـە جێگاو ڕێگای ئەو مانگەم نەدیوە.

(٢) بەدری هیلال: مانگی یەکشەوە، جەور: زوڵم و ستەم.
هەروەکو چۆن مانگی یەکشەوە وەکوە دەمـی داس وایـەو چـەماوەتەوە، منـیش هـەروەکو مانگی یەک شەوە پشتم چەماوەتەوە ئەویش لەبەر زوڵم و ستەمی پەرچەمی کە ئەزیـەت و ئـازارێکی زۆرم دەدات، چاوەکانیشـی بـاش ئـەوە دەزانـن شـاهیدن لەسـەر ئـەوەی بـاڵام چەماوەتەوە.

(٣) عازر: پیشاندانی روخسار، شەمس: رۆژ، جەمال: جوان، تەلعەت: دەرکەوتن.
ئەورۆژەی کە روخسـارت پێشـاندا کەهـەر دەتگـووت گـوڵ کـەرەمت کـرد لـەورۆژەوە رووی جوانی تۆ وەکو رۆژ دەدرەوشایەوە، جا لەبەر تیشکی جوانیت قەدەغـەی بینـینی رۆژم لـێ دەکات.

(٤) لەعلی یەمانی: مەبەست جوانی لێوی یارە، عەقد: ملوانکە.
لێوی جوانی یار دەڵێی لەعلی یەمەنەو هەروەها زنجیرەو ملوانکەی گـەردنی ملـی هـەروەکو مەرجانە ئەوانە رایان کردووە فرمێسک لەچاوەکانم قەتیس ماون و نایەنە خوار.

خــــــاڵی دەمێکــــــە خــــــەیاڵم لــــــەخاڵی رووی
مــــەنعم مەکــــەن لەپــــەردەی عــــارم دریــــوە مــــن[١].
فەســــلی خەزانــــەو وەخــــتی خــــەزان بەســــەر رەوان
ســــەرمای ســــاردی میهــــری یــــارم چێشــــتووە مــــن[٢].
گەرچــە زولفــت خەزانــە بــۆ وەرقــی ســەبزی ســەر رەزان
زانــــیم کــــە حــــوجرە ســــاردە تفــــاقم کڕیــــوە مــــن[٣].

---

(١) مانع: قەدەغە، عار: شەرم.
دەمێکە خەیاڵم لەلای خاڵی رووی نەماوە بۆیە قەدەغەم مەکەن کەمن پەردەی شەرمم دڕیوە، بێ شەرمانە قسە دەکەم.

(٢) فەسلی خەزان: وەرزی گەڵا هەڵوەرین، رەوان: گیان، بەسەر رەوان: باڵای بەرز و رێکی لەرۆیشتنی یار.
ئێستا وەرزی هەڵوەرینی گەڵاکان واتە لێك دابڕانی خۆشەویستان لەگەڵ یار ئەو یارەی باڵای بەرزەو جوان دەڕوات لەرۆیشتندا، یاریش لەگەڵمدا ساردە بۆیە ئەو سەرماو ساردییەی کەیار لەگەڵمدا هەیەتی بۆتە دووری لە سۆزو میهرەبانی ئەوەش وای کردووە بەجێی بهێڵم.

(٣) وەرق: گەڵا، سەبز: روانی موو لە رووخساری گەنجان یاخود سەوزەو گژوگیا، رەزان: میوە، حوجرە: شوێنی حەوانەوەی فەقێیان، تفاق: کەلوپەل.
هەرچەندە لوتفی تۆ لێك دابڕانە و حەز بەو دەکەی وازم لێ بهێنی هە روەکو چۆن لە وەرزی خەزان گەڵا لە دارو میوە هەڵدەورەێ، بەوەش هەستم بەوە کرد کە حوجرە ساردە بۆیە کەلوپەلم کڕی.

لــــەو وەختـــەوە لەخزمــــەتی تـــۆ پـــێم بڕێـــوە مــــن
وەك مـــــن بەشانســـــیت و رەنـــــگ بریــــوە مـــــن[١].
مــــن پــــڕ دەکـــەم تـــەنووری موحبـــەت لـــەناری شـــەوقی
تـــۆش ئاشـــی لـــێ بـــنێ کـــە دڵـــم دەرپـــەڕیوە مــــن[٢].
فـــەرمووی وەرە کـــە خۆشـــی غـــەزەل لـــەدەم و لێـــوت
جـــەرگ و دڵـــم بـــەناری موحیبـــــت کوڵیــــوە مـــــن[٣].

(١) لەوکاتەوەی لەخزمەتی تۆدا پێم لێ بریوی هاتوچۆت ناکەم لەبەهرەو سۆزو میهرت بێ بەش بویمە، تۆش وەکو من خەفەتباری و هەرچی رەنگ هەیە لەروخسارت بریوم رەنگم تێدا نەماوە لەتاو دووریت.
(٢) نار: ئاگر، شەوق: بریسکەدار، ئاش: چێشت— ئامێری هارینی دانەوێڵە.
من دڵم پڕ دەکەم لە تەندووری خۆشەویستی ئەویش بەئاگری بڵێسەدارت تۆش هەستە چێشتێك لێ بنێ من وا دڵم تەقیوەو دەرپەڕیوە.
(٣) غەزەل لەدەم و لێوت: قسەی خۆش لە دەم و لێوت دێتە دەرەوە، ناری موحیبەت: ئاگری خۆشەویستی.
فەرمووی وەرە بەو خۆشیەی لەقسە لە دەم و لێوت دەبارێ، بەو قسە خۆشانەت جەرگم و دڵم بەئاگری خۆشەویستیت کوڵاوە.

# پیتی هاء

دەرچـــوونی گــــەلیٚ موشــــکلە دەرچـــوون قریبـــە
روح و دڵەکــــــەم مــــاوە بەتــــەنیا وەرە بیبـــــە[١].

قوربـــانی ویســـالت بم ئـــەوا کوشـــتمی هیجرانـــت
خـــۆت وارس و حـــەق دارمـــی قاتـــل کـــە رەقیبـــە[٢].

خـــۆت دیوتـــە لـــەنێو مســـری مەلاحـــەت چـــەغریبی
ســـا رەحمـــیٚ بـــەحاڵی دڵەکـــەم کـــە کـــە غەریبـــە[٣].

هـــەردوو گـــوڵی زوڵـــف و روخـــی نـــارت ســـببە وا
ئەشـــکم کـــە پەیاپـــەی دیٚ و دەروونم بەلەهیبـــە[٤].

---

(١) موشکلە: زەحمەت، قریب: نزیك.
دەرچوونی خۆشەویستی ئەو لەدڵم گەلێك زەحمەتە، هەربۆیە دەرچوونی من گەلێك نزیك بۆتەوە، بەتەنهاش رۆح و دڵم بەردا ماوە وەرە ئەویش ببەو با ئەوانیش نەمێنێت.

(٢) ویسال: بەیەکگەیشتن، هیجران: دوورکەوتنەوە لە دۆست و یاران، واریس: میرات گر، قاتل: بکوژ، رەقیب: دوژمن.
هەرکاتێك پێت دەگەم دڵم خۆش دەبێت بۆیە دەمەوێت خۆم بەقوربانی ئەو بەیەك گەیشتنەت بکەم چونکە جیابونەوەت لێم دەمکوژێت، بۆیە هەردەم حەز بە بەیەك گەیشتنت دەکەم چونکە تۆ میراتگری حەق داری منی دوژمنیش بکوژمە.

(٣) مسری مەلاحەت: جوانی دلبەری مسر مەبەست حەزرەتی یوسف و زولەیخایە.
خۆت دیوە لەنێو جوانانی وڵاتی میسری چەندە غەریب و کەساسی، تۆش وەرە هەندێك رەحم بەو دڵەی غەریبی من بکە کەزۆر کەساس و بیٚ کەسە.

(٤) روخ: رووخسار، نار: ئاگر، سبب: هۆ، ئەشك: فرمێسك، پەیاپەی: لەدوای یەك بەردەوام، لەهیب: ئاگری بلێسەدار.
هەردوو گوڵی زوڵف و روخساری گەش و جوانت هۆکارن بۆئەوەی بەفرمێسکم بەبەردەوامی و یەك لەدوای یەك لەچاوانم دێتە خواریٚ دەروونیشم بۆتە یەك پارچە ئاگری بڵێسەدار.

رەبــــی بەخەنــــدەگی خـــــەمی دووری دڵ کــــون بــــێ
هەرکـــــەس لــــەنیگاهەت کــــە بـــــەئارام و شـــــەکیبە [١].

وازەن مەبــــە گیــــان ســـــەخت و ســـــەمەرگم کـــە نـــەمردووم
ئومێــــــدی ویســـــــاڵت وەکــــــو لوقمـــــانی تەبیبـــــە [٢].

تــــابوری مــــوژەت چــــەندە بــــە تـــــەرتیب و نیزامـــــە
بــــۆ ســـــەف شــــکەنی دڵ چـــــە ســــوپاهێکە مەهیبـــــە [٣].

وا لەشـــــکری ئــــاهم چـــــووە ســــــەر کــــافری زوڵفـــــت
گـــەر شـــاهی روخـــت لێـــی بگـــەڕێ ســـەیری عەجیبـــە [٤].

---

(١) خەدەنگ: برژانگ، شەکیب: ئارام و لەسەرخۆ.
یـاخوا بەبرژانگـە تیـژەکانت دڵـم کـون کـون بێـت واتـە هاویشـتنی هـەر تیرێکـی برژانگـت ئاراستەی دڵم بکەی کونی بکەی هەرکەسێك بەوێنەی جوانیت ئارام و سەبری هەبێت.

(٢) وازەن مەبە: واهەست مەکە، لوقمانی تـەبیب: لوقمـانی حـەکیم کـە قورئـان باسـی دەکـات ﴿ وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴾ (لقمان: ١٣).
وا هەست مەکە کە گیانم زۆر سەختە لـەحالی سـەرەمەرگدا هێشـتا نـەمردووم چـونکە هـەر ئومێدم بەیەك گەیشتن هەیە هـەرکاتێك تـۆ پـێم بگـەی و بێیـە لام تـۆ بـۆمن وەکـو لقمـانی حەکیمی.

(٣) تابور: لەشکر، موژە: برژانگ، تەرتیب و نیزامە: رێك و پێك، مەهیبە: بەهەیبەت.
لەشکری برژانگت زۆر بەرێك و پێکی وەستاون و خۆیـان ئامـادە کـردووە بـۆ هێـرش کردنـە سەر دڵم وەرە سەیربکە ریزەکانییان بۆتە سوپایەکی بەهەیبەت بەترس بۆ هێرش کردن.

(٤) ئاه: هەناسەی نائومێدی، شاه: پاشا، عەجیبە: سەیرە.
ئاهو هەناسەم بۆتە لەشکرێکی شکسـت خـواردوو ناچـاری ئـەوە بـوو بێتـە سـەر تاریکـایی زوڵفەکانت بەمـەرجێك گـەر بێتـو رووخسـاری جـوان و گەشـاوەت لـێ بگـەڕێت و رازی بێـت ئەوەش شتێکی سەیرو سەمەرەیە.

بــــۆ مشـــــكی خـــــەتا چـــــوو بەخــــــەتا نێــــو چــــین
لــــەو بونـــــەوە زوڵمەتـــــە شـــــامی بـــــە نەســـــیبە[١].
قوربـــــانی وجـــــوە و ئومــــــەنای شـــــاهی روخـــــت بم
هەریەكـــــە لـــــەجێی خـــــۆی چـــــە ئـــــەمرێکی ئەدیبـــــە[٢].
تەســـــکینی دڵـــــت هـــــاتووە ئۆخـــــەی كـــــە حـــــەریقی
یـــــارب كـــــە بـــــەخوێنی جگـــــەرت كـــــەفی حەزینـــــە[٣].

(١) مشكی خەتا: مشك بۆنی خۆش وڵاتی خەتا كە دەكات باكووری وڵاتی چین، خەتا: گوناه، زولمەت: تاریكی، شام: سەرتایی تاریكی داهاتن، نەسیب: قسمەت بەش.
بۆ وەدەست هێنانی بۆنی خۆشی وڵاتی خەتا، بەڵام بە هەڵەو بێ گوناه كەوتە وڵاتی چین و لەوێ خۆی دیتەوە، جا لەو بۆنەوە هەموو زولمەت و داهاتنی تاریكییەكە دەبێتە بەش و قسمەتی.
(٢) وجوە: روو رووخسار، ئومەنا: دەست پاكی و ئەمین.
بەقوربانی روو رووخساری ئەمینت بم كە چ دەست پاكە لەگەڵ رووخساری شاهانەت كە دەدرەوشێتەوە كە هەریەكێك لەوانە زۆر بە ئەدەبەوە فەرمان دەكەن.
(٣) تەسكین: فەرامۆش، كەف خەزیب: دەست خەناوی.
ئۆخەی وا دڵت داكەوت حەریقی فەرامۆشی دڵیشت هات چونكە بەخوێنی جگەرم یارەكەم دەستی خەناوی دەكات یاخود دەست لەجەرگم وەردەدات و دەستەكانی سوور دەبێت هەردەڵێی لەخەنەی ناوە.

لــەئادەم تــا بەخاتــەم جوملــەی عالــەم پــڕ ســەداو ســەیدە
بەعەشقی حەزرەتی لەولاك ئــەوەی زینــدو نــەبێت مەیتــە[١].
تەتیمــەی هــەر ســەلات و خاتیمــەی حەمــدو تەحیــەی حــەق
ســەنا بــۆ ئــال و بەیتــە بــاقی هــەر ئەفســانەو بەیتــە[٢].

---

(١) ئادەم: باوکی گەورەی مرۆڤ خوای گەورە درووستی کردووە لە قوڕ، وەکو لەفەرموودە هاتووە (هەمووتان لەئادەم و ئادەمیش لەقوڕ) خاتەم: کۆتایی مەبەست پێغەمبەرە (ﷺ) جوملەی عالەم: هەموو خەڵك، سەداو سەیتە: دەنگ دانەوە، حەزرەتی لولاك: مەبەست پێغەمبەرە (ﷺ) کەلە فەرموودەیەك هاتووە (لولاك لولاك لما خلقت افلاك) مەیت: مردوو.
هەر لەو رۆژەی خوای گەورە ئادەمی لەسەر زەوی درووست کرد (إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً) بقرە، هەتا دەگاتە کۆتایی پێغەمبەران کە محمدە(ﷺ) لەناو سەرتاپای خەڵکدا ئەو دەنگ و ئاواز هەیە و دەنگ دەداتەوە بەعەشق و خۆشەویستی حەزرەتی محمد(ﷺ) ئەو زیندو نەبێت مردووە.
زانایان دەڵێن (مردن) بریتییە لە نەبوونی ژیان واتە عدم شتی عەدەمی خەلق و ئیجاد رووی تێ ناکا، وەڵام بۆ ئەوانە هەندێك دەڵێن: خەلق بەمانا تەقدیرە وە مردن هەرچەند عەدەمی بێ هەر موقەدەرەو مەعلومەو لەلایەن خوداوە بڕیاردراوە، هەندێکی دیکە دەڵێن شتی عەدەمی هەرچەند لەبوونی زاتی خۆیدا پێویستی بە خەلق و ئیجاد نییە، بەڵام لەکردنی هەر روحی بە مەحەل بۆ پەیوەندی مەوت موحتاجە بەخەلق، بەڵام زانایان فەرموویانە دەلیلێکی قەگعی لەسەر ئەوە نییە کە مردن عەدەمی بێت هەڵدەگرێ شتێکی وجودی بێ لەبەرامبەر ژیان وەکو با لەبەرامبەر چرا وەکو چۆن رووناکی بەبا ئەکوژێتەوە وەها ژیانی گیانلەبەریش بەو مردنە کە هێزێکی موعاریچی ژیان بێ بەرباد ئەبێ (تەفسیری نامی بەرگی ٧، ل٩٩).
(٢) تتم: تەواو، خاتیم: کۆتایی، تەحیە: سەلام، سەنا: ستایش، ئال و بەیت: بنەماڵەی پێغەمبەر(ﷺ)، باقی: ئەوەی ماوە، ئەفسانەو بەیت: پەندو بالورە.
کۆتایی و تەواوبوونی هەرناردی سەلات و سەلامە بۆ گیانی ئەو پێغەمبەرە بۆیە جگە لە ستایش کردنی ئەو ئال و بەیتی ئەوەی دیکە هەموو قسەی بێ سوودو بێ کەلکەو پەندو بالورەی کۆنە.

لـەپاش سـیفەی تـەرازی و ئایـەتی تـەتهیری سـەحب و ئـال
بـــەقورئان مـــەدحیان نـــایێ بەجوملـــە زیتـــەو کیتـــە [١].
کەتۆش لەو نەسـلیە جـەددت رەزابـێ شـێر بـەگوێ دەگـرێ
وەکـــو رێـــوی زەلیلـــی گـــورگی نەفسـم سـا لـەبۆ کێتـە [٢].
لـــەخۆت و جـدی خـۆت و نەسـلی پاکـت چـاوەڕێی لـوتفم
لـــەڕێی حەقـــدا مـــوعینم بـــن لەغـــەوغای رۆژی یالیتـــە [٣].
بەشـــاهێدبن ســـەگی قافلـــەی تـــەریقی ئـــال و ئەســـحابم
هەمیشە گوێ قولاغی بانگی هـەی هەیمـەو سـەدای هەیتـە [٤].

(١) سیفەی تەرازی: شێوە و چۆنییەتی، تەتهیر: خاوێن کردنەوە.
لـەپاش شـێوەو چـۆنییەتی خـاوێن کردنـەوەی کـەس و کـارو یـاوەرانی پێغەمبـەر (ﷺ) بەقورئان نەبێت مەدحیان ناکرێت گەر هەموو خەڵك دانیشن مەدحیان تەواو نابێت.
(٢) نەسل: رەچەڵەك، جەد: باپیر.
کەتۆ رەنگ و رەچەڵەکت لـەو بـاپیرەوە بێـت دەتـوانی شـێر بـە گوێیـەکانی بگـری منـیش هەروەکو چۆن رێوی لەبەردەم گورگدا زەلیلە منیش لەبەردەم نەفسـی خـۆم ئـەوها زەلـیلم خۆی رێوی و نەفسیش گورگ لەچاو برسییە.
(٣) موعینم: یارمەتیدەر، غەوغا: ئاژاوە، یالیت: هاوارە.
داواکارم لەخۆت و باپیرت نەسلی پاك و خاوێن (رەچەڵەکی پێغەمبەران خاوێنـە) چـاوەڕێی لوتف و میهرەبانیم لەرێگای هەق و راستیدا یارمـەتی دەرم بـن لـەو رۆژەی ئـاژاوەو هـەرای رۆژی هاوارو واوەیلایە، لەکاتی کۆکردنەوەی بـەنی ئـادەم لـەرۆژی مەحشـەردا کـە رۆژێکـی زۆر تەنگانەیە هەرکەس کتابی کردەوەی دەدرێـتێ کەهـەموو کردەوەکـانی خۆیـانی تێدایـە ئاماژەیـە بـۆ سـوورەتی کهـف ﴿يَٰوَيۡلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلۡكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةٗ وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحۡصَىٰهَاۚ﴾ (الكهف: ٤٩).
(٤) بەشاهێدبن هەرهەمووتان من سەگی کاروانی رێگای راستی ئال و ئەسحابی پێغەمبـەرم کـە ئـاینی ئیسـلامە هـەموو کـاتێکیش گـوێی خـۆم سـووك کـردووە بۆبـانگی هـەی هەیمـە دەنگەدەنگی هەیتە.

بەئیســـــتمداد و لـــــوتفی بابــــە شـــێخ و هیمـــــەتی کـــاکی
گروگـــالی ئەکـــەم دا بڵـــێن پێـــی کـــوێرو شـــەلان پەیتـــە [1].
ئەگەرنا من لەفرشی خاکی ئـال و جێـی فـەوقی عـەرش پـاك
مسـافەی عـەرش و فـەرش وەکـو زاهـرا بـێ روون زەیتـە [2].
کەسـێ صـالح بـێ بـۆ زیکـرو دوعـا گۆبیـت بـەبێ چـاوی
هـەزار چـاو سـاغی وا دێـنێ بەچـاو زینـد بـەدڵ مەیتـە [3].
لـەبۆ تەشـریفی رێمـە معراجـی جـدت بـۆ ئـەدای هـاتف
تعـــــال یـــــا حبیـــــب اللّه تمنـــــی ماتمنیـــــت [4].
دەری رەحمەت گوشادو بابی تۆبە واسع رێگەی رجا کیدە واسع
دەسا تۆش هیمەتێ کـە جەعفـەری تـۆ روکـنی ئـەو بەیتـە [5].

---

(١) ئیستمداد: داوای یارمەتی کردن، گروگال: گالول.
هەروەها داوای یارمەتی و لوتفی بابەشێخ (دەبێت شێخ شمس الدین) بێت، هیمەتی کاکی دەکەم ئێستاش وەکو منداڵ گالولکی دەکەم و پێویستم بەدەست گرتنی ئەوان هەیە بۆئەوەی دەستم بگرن و بەسەرپێ بکەوم.
(٢) ئەی ئەو بەیتە پەیوەندی هەیە لەبەیتی پێشوو ئەگەرمن لەفەرش و رایەخی خاکی ئال و بەیتن عەرشی بەرزی کە ئەو عەرشە وەکو ئەستێرەی زوهرا گەش و رووناکە.
(٣) صالح: پیاوچاك، مەیت مردوو.
هەرکەسێك گەر کردەوەی چاکی هەبێت بۆ زیکرو دوعاو خواپەرستی بەبێ چاویش بێت، ئا ئەوکەسە هەزار چاوساغی بەقوربان بێت، چونکە ئەگەر چاوی ساغە بەڵام بەدڵ مردووە ئەو بەیتە ئاماژەیە بۆ ئایەتی ﴿فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَٰكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ﴾(الحج:٤٦).
(٤) میعراج: شەورەو، ئەدای هاتف: بانگ کردن.
بۆ تەشریفی رێگای شەورەوی پێغەمبەر (ﷺ) کە باپیرتە بانگ دەکاو دەڵێت وەرە ئەی خۆشەویستی خوا ئەو داوای دەکەی داوای بکەو جێبەجێ دەبێت.
(٥) واسع: فراوان، بابی تۆبە: دەرگای تۆبە، رێگای رجا: رێگای پاڕانەوە.
دەرگای رەحمەتی گوشادو کراوەو بەئارام بێت و دەرگای تۆبە کردنیش فراوانە واتە

لەسینەی چاکی خۆت وەك شانە خەتی موو بە موویـنـە
مـەڵێن تـا غەیبەتـە باسـی جـەمالی روو بـەروو بینـە [١].
جزوبەنـدی کتـابی عـومرو شـیرازەی سـەحیفەی دڵ
بەرشـتەی ئولفـەتی یارانـە گـەر ئـازای دەزوو بێنـە [٢].
تـەهارەتییان بـەخوێنی جەرگـە مـەردانی رێـی مەقسـەد
هـەتا قـەترەیێ لەچـاوتا مـاوە، تـۆش ئـاوی وضـوبێنـە [٣].
نـەوەك مەیخانـە خـالی بـێ، هـەتا پـیری موغـان مـاوە
سـەرم قوربانـت ئـەی سـاقی، گـەلێ تێنـوم سـەبو بێنـە [٤].

---

کراوەیە بۆ تۆبەکاران و رێگای پاڕانەوەش کراوەیە، کەواتە تۆش جەعفەری هیمەتێك بکە چونکە ئەو پاڕنەی بەرپێتە.

(١) لەدڵ چاکی و سینە پاکی خۆت وەرە خەتی موو بەموو شانە بکە زۆر بەوردی بیکە هەتا نەڵێن باس کردنی جوانیت غەیبەتە وەرە بەرامبەرو رو بەروو بیبینە.

(٢) جزوبەند: دورینـەوەی کتێب بە بەش بەش، سەحیفەی دڵ: لاپەڕەی دڵ، پەرشتە: دەفتەری حساب، ئولفەت: راهاتن، دەزوو: داو، خێرا.

کتابی تەمەن وا دەڕوا و شیرازەی لاپەڕەی دڵیش خەریکە پڕدەبێتەوە کاتیان بەسەرچووە بەڵام دەفتەری کردەوەکانیش راهاتییە لەگەڵ یاران و خۆشەویستییان کەواتە ئەگەر تۆ کەسێکی ئازای هەستە داو و دەزوو بێنە بۆ دوورینـەوەی جزوبەندکردنی دەفتەری کردەوەکان چونکە کات بەسەرچووە.

(٣) تەهارەت: خاوێن-پاك، مەقسود: مەبەست، قەترە: دڵۆپ، وچو: دەستنوێژ خۆ خاوێنکردنەوە یان لەجیاتی بەئاو بێت بەخوێنی جەرگە ئەوکەسانەی کە مەردی رێگای خودان و رێگای خوایان مەبەستە، کەواتە ژیانی مەردانی خوا بەئێش و ئازارە، جا کەواتە تۆش هەتا یەك دڵۆپە ئاو لەچاوتا مابێت هەوڵ بدە بۆ وەدەستهێنانی ئاوی دەست نوێژ.

(٤) مەیخانە: شوێنی ئارەق خواردنەوە، خالی: چۆڵ، پیری موغان: پێشەوای ئاینی، ساقی: مەیگێڕ، سەبو: گۆزە مەی تێدا دەکرێ.

هەتا پێشەواو رێبەر لەمەیخانەدا ماوە چونکە ئەو بڕوات مەیخانە کەسی تێدا نامێنێ کەواتە بەقوربانت بم ساقی ئەو هەلە لەدەست مەدەو منیش گەلێك تێنوم هەستە گۆزە بهێنە با تۆش بکەم.

کتـــابی ئولفـــەتی جـــام و شـــەرابی جەرگـــە نامـــەردان
دەخیلـــت بم وەرە مـــوترب روبابـــەت زوو بـــەزوو بێنـــە [۱].
دهـــانی شیشـــە بەســـتە ســـوحبەتی نـــا ئەهلـــە لـــەم بەزمـــە
موغـــەنی ئـــەدای ناکـــات لـــەناو پـــەردەی گـــەرو بێنـــە [۲].
دەڵـــێن بـــەردی ئەجـــەل مینـــا شـــکێنە و تەفرقـــە خێـــزە
(حـــەریقی) ئەگـــەر شـــێت نیـــت دەســـا بـــاریٚ کـــدو بێنـــە [۳].

---

(۱) جام و شـەراب: پیاڵـەی مـەی، دەخیلـت بم: بـەقوربانت بم، مـوترب: گـۆرانی بێـژ، روبـاب: ئامێرێکی مۆسیقایە.
کەسانی نامەرد بزانن کتێبی ئێمە کە ئولفـەتمان پێـوە گرتـووەو لەگـەڵی راهـاتووین جـام و شەرابی جەرگە کە خوێنی لێوە دێت جا موترب گۆرانیبێژ تۆش هەستەو خێراکە روبابەکەت لێدە بۆئەوەی ببێتە مەزە بۆمان پێوەی مەست بین.
(۲) دەهان: دەموزار، شیشە: شووشە، سوحبەت: قسـەکردن، نائـەهل: بـیٚ ئەسـل و نەسـەب، موغەنی: گۆرانیبێژ، نەوا: دەنگ.
دەمی شووشە بەستراوە هیچی لیٚ نایەتە دەرەوە ئەوقسانەش کە دەکرێت قسەی کەسـانی بیٚ ئەسلٚ و نەسەبن، دەی گۆرانیبێژ تۆش بۆچی دەنگت لیٚ نایەت هەسـتە لـەناو پـەردەی گەرووتدا سەدات بێنە.
(۳) مینا: ئاوێنە کەروێکی بەمادەی جیوە روپۆش کراوە، تەفرەقـە: پەرتـەوازە، خیـزە: کـات، کدو: کودی خواردن.
واباوە کەدەڵێن هەرکاتێك ئەجەل هات ناگەرێتـەوە هـەروەکو چـۆن بـەرد لەئاوێنـە دەگـری کاتێك پێی دەکەویٚ دەشکێت ئەجەلیش بەوشێوەیە لەهەمانکاتیشدا ئەجـەل دەبێتـە هـۆی لێك جودابوونـەوەی خۆشەویسـتان، جـا حـەریقی ئەگـەر شـێت نیـت هەسـتە بارێـك کـودی بهێنە.

**چـــاوەڕێی مـــژدەی نەســـیمم تـــا لەگوڵشـــەن دێتـــەوە**
**بەڵکـــە فـــەرمایش بکـــا گـــوڵ، بولبـــولم بابێتـــەوە [١].**
**وا وەعیـــدەی بـــەفری زســـتانی فیراقـــت کەوتـــە دڵ**
**هـەر بـەبای وەعـدەی ویسـاڵت کێـوی دڵ ڕەش بێتـەوە [٢].**
**میروەحـــەی زوڵفـــت لـــەدەوری ئاتەشـــی ڕووت بـــیّ، چـــلۆن**
**ئـــاگری عیشـــقت بـــەئاوی چـــاوی مـــن ئەکوژێتـــەوە [٣].**
**سووچـی زوڵفـت بـوو کـە پەروانـەی دڵ ڕووی کـردە ڕووت**
**ئـــاگری وەســـڵی شـــەم و پەروانـــە شـــەو دەگرێتـــەوە [٤].**

---

(١) نەسیم: شنەبا، گوڵشەن: ئەو جێگایەی گوڵی زۆری لێیە گوڵستان.
چاوەڕێی مژدەی هاتنی شنەبام هەتا لەگوڵستان دێتەوە، چونکە هـەرکاتێك ئـەو شـنەبایە بەسەر ئەو گوڵستانە تێپـەڕ دەبێـت بـۆنی گوڵـەکان هەڵدەگرێت واتـە شـنەبایەکە دەبێتـە گوڵاو، بۆئەوەی گوڵ فەرمان بکات بولبول بێتەوە لەسەر گوڵەکان بخوێنێت.
(٢) بـەفری زسـتان: دابڕانـی دوو خۆشەویسـت مەبەسـتە، فـیراق: جیابوونـەوە، ویسـاڵت: بەیەکگەیشتن.
وا لێك دابڕانی خۆشەویستم هاتە نێو دڵم، جا ئەگـەر بێتـو وەعـدەو کـاتی ئـەو لێـك دابڕانـە کۆتایی بێت و بەیەك بگەین و ئەو چیا گەورەیەی دڵ بەجارێك ڕەش بێتەوە.
(٣) میروەحە: پانکە، ئاتەش: ئاگردان، ئاوی چاو: فرمێسك.
زوڵفت هەروەکو پانکە بـەولاو بـەولادا دەسـووڕێتەوە وەکـو فێنـك کـەرەوە ئـاگردانی ڕووت فێنـك دەکاتـەوە چـونکە ڕووت وەکـو ئـاگر وایـە، ئـاگری خۆشەویستیشـت گـڕی گرتـووە بەفرمێسکی چاوەکانم دەکوژێتەوە.
(٤) سووچ: گوناه، پەروانە: پەپوولە، وەسڵ: گەیشتن، شەم و پـەروانە: مۆم و پـەپوولە.
گوناهی زوڵفەکانت بوو کە لەسـەر ڕووت وەلاکـەت و ڕووت بـەدیار کـەوت دەتگـووت چـرایە دەدرەوشـێتەوە منـیش وام هەسـت کـرد کـە چـرایە دڵیشـم وەك پەپوولـە ئاسـا هـەر لـە دەرەوەی ڕووت دەسـووڕایەوە هـەتا خـۆی لـەئاگرە دەدات و لەعەشـقی ئـاگردا دەسـووتیّ دیارە چراش شەو دادەگیرسێت جارێکی دیکە چاوەڕێ دەکەم هەتا شەوێکی دیکە دێتەوە.

خەت و موهری زوڵف و خاڵت حوجەتی موڵکی دڵە
نەخشی ئەو مۆرە بەئاوی (خور)ە ناچێتەوە[١].

دڵ لەترسی چاوی رووی کردبووە میحرابی برووی
ئێستە بیستوومە لەچینی زوڵف جێی نابێتەوە[٢].

کێوی هیجرت خستە سەر شانی دڵم پێی خستووە
تا نەگا دەستی بەزوڵفت زەحمەتە هەستێتەوە[٣].

سەد کەرەت خستمە گێژو مەهلەکەی بەحری فراق
ئاخری موژگانی قولاییت دەرم دێنێتەوە[٤].

---

(١) حوجەت: هەنجەت-بیانو، موڵکی دڵ: مەبەست هێز و توانای دڵە.
خەت و خاڵی موهری زوڵف و هەموویان بیانۆیە (هەنجەت) لەسەر تواناو هێزی دڵ چونکە ئەو نەخشی مۆرە کە هەیە لەسەر دڵ بەهیچ شتێك هەتا ئاوی خورخورپین لێ ناچێت نافەوتێ.

(٢) دڵ لەتەسی چاوی روو لەسەر برۆ کەونییەکەی بوو، گوایە ئێستاش لەنێو زوڵفی چین چینی جێگای نابێتەوە.

(٣)بەجێی هێشتی تۆ بۆمن بۆتە گرانایی بەقەد کێوێك ئەو گرانایيەش کەوتۆتە سەرشانی دڵ و دەروونم لەپێی خستووم، هەتا دەستی بە زوڵفەکانت نەگات توانای هەستانەوەی نییە، بەڵام هەرکاتێك دەستی بە زوڵفەکان گەیشت بەهێزی زوڵفەکاندا هێز پەیدا دەکات و هەڵدەستێتەوە

(٤) مەهلەکە: جێگای لەناو چوون، بەحری فراق: مەبەست لێك جیابوونەوەیە، موژگان: برژانگ، قولاب: چەنگال.
سەد جاران منت خستە ناو گێژاو جێگای لەناو چوون دەریای لێك جیابوونەوە، هەتا کار گەیشتە ئەوە بەبرژانگەکانت کە وەکو چەنگاڵ تیژو چەماوەی لێم گیربکەی و جارێکی دیکە لەو جێگای لەناوچوونەوە دەرم بهێنیتەوەو رزگارم بکەی.

مەزرەعەی موهرو موحبەت توخمی وەسلی شین نەکرد
گوڵ بەشادی دائەچێنم خاری غەم ئەڕوێتەوە [١].

خۆت ئەزانی مدەتێکە گەردی پامالی جەفام
کەی وەکو نەقشی قەدەم سەردێنێتە ژێر پێتەوە [٢].

دڵ ئەوا کەوتۆتە زیندانی غەمت قوربانتم
تایەکەی زوڵفت بنێرە بەڵکە بۆم دەربێتەوە [٣].

توخودا کەی لەتاریکی شەوی هیجرانی تۆ
دەستەو ئەژنۆ دابنیشم رەببی کەی رۆژ بێتەوە [٤].

---

(١) مەزرەعە: کێڵگە، موهرو موحبەت: خۆشەویستی و میهرەبانی، خار: درك و داڵ.
زۆر هەوڵمدا و هیلاك بووم خەریکی چاندنی میهرو خۆشەویستی بووم کەچی بەو خۆشەویستییە نەگەیشتم و هیچی لێ شین نەبوو، من هەر خەریکی چاندنی گوڵی شادی بووم کەچی ئێستا درك و داڵی غەم و خەفەت دەڕوی بۆم.

(٢) خۆت دەزانی ماوەیەك دەگەڕێم ئەزیەت و ئازار دەچێژم، جا نازانم کەی نەخشی بەری مل کەچ دەبێت دێتەژێر بارو خۆی تەسلیم دەکات و دێتە ژێر پێتەوە.

(٣) تایەی زوڵف: مووی زوڵف.
دڵ دەمێکە کەوتۆتە نێو زیندان لەغەم خەفەتتدایە، دەی قوربانتم بۆ ئەوەی لەسەر خەم غەفەتی زیندان رزگارم بێت تاڵە موویەکی زوڵفتم بۆ بنێرە هەتا دڵمی لێ گیر بکەم بەڵکو دڵم رزگاری بێت.

(٤) هیجرانی تۆ بۆمن وەکو شەو وایە، توخوا هەتاکەی لێم دوور دەبیت بەتەنها بژیم چونکە شەوی تاریك بەسەر ناچێت ئەی خودایە هەتاکەی دەست بەئەژنۆ دابنیشم بەتەنهایی خودایە دەبێت کەی رۆژ ببێتەوە، کاتێك هیجرانی ئەو نامێنێت دەبێتە رۆژو رۆژ هەڵدێت کاتێك ئەوم لێ بزربێت ئاوا دەبێت و دەبێتە شەو.

بـــێ ئیشـــارەی حکمـــت العـــین شـــیفات نـــابێ شـــیفام
خـــۆت دەزانـــی زامـــی دووری ســـەختە خـــۆش نابێتـــەوە [١].

فکـــری مـــن چـــونکە دەقیقـــە عاشـــقی قـــەدی ئـــەوە
مـــوو لـــەموو گـــیراوە چـــیبکەم لێـــک جـــوێ نابێتـــەوە [٢].

زەخمـــی دڵ بـــێ مەرهـــەمی وەســـڵی بەناســـوور کـــەوتووە
ئـــەی (حـــەریق) باســـی مەکـــە توخـــوا بـــەلا نەکولێتـــەوە [٣].

---

(١) حکمت العین: حکمەتی چاو، زام: برین، خۆش نابێتەوت: چاك نابێتەوە.
بەبێ ئامارژە پێکردنی حکمەتی چاو شیفات نابێ، چونکە خۆت چاك دەزانی زام و برینی دووری دەردێکی گرانە و قورسە وا بەئاسانی ئەو برینە سارێژ نابێت.

(٢) فکر: بیر، دەقیق: ورد، قەد: باڵا، موو لەموو: موو تێك ئاڵاون.
بیری من گەلێك وردە هەردەم لەفرکو خەیاڵی ئەوە منیش عاشقی قەدو باڵای ئەو بەجۆرێك ئەو عەشقە وەها تێکەڵاو بووە وەکو دوو موو تێك ئاڵاوی وەها بەئاسانی ناتوانرێ لێك جیا بکرێتەوە واتە زەحمەتە لەفکر دەرچێت خۆشەویستی ئەو.

(٣) زەخم: برین.
برینی دڵی من بەناسوور کەوتووە چاری ناکرێت بەبێ مەرهەم، دیارە مەرهەمی برینی دڵیش گەیشت بەیار بۆیە گەر پێم بگات ئەوە چاری برینمە دڵم دەکرێت گەرنا زەحمەتە چارەسەری ئەو برینە، جا کە وایە حەریقی باسی لێوە مەکە بائەو برینە نەکولێتەوە.

مــــوژدە بــــێ بولبـــولی دڵ گـــوڵ لـــەباغان هاتـــەوە
قومری عومری خۆی سـەرف کـا سـەروی بوسـتان هاتـەوە[(١)].

شاســـواری عەرســـەیی مەیـــدانی مـــەردان هاتـــەوە
دلبـــەری جانـــان لەخزمـــەت جـــانی جانـــان هاتـــەوە[(٢)].

پـــیری روشـــن دڵ وەکـــو خورشـــیدی تابـــان هاتـــەوە
نـــایبی عوسمـــانی ثـــانـــی خـــۆش بەســـامان هاتـــەوە[(٣)].

وا موعەتتـەر بـوو دەمـاغی ئـەهلی نیسـبەت هـەر دەڵێـی
نیســـبەتی پیراهـــەنی یوســـف بەکـــەنعان هاتـــەوە[(٤)].

---

(١) قومری: کوکوختی–مەلێکە لە کۆتر دەچێت، سەرو بوستان: درەختی جوانی دارستان باخچە.

موژدەت لێ بێت ئەی دڵ کە هەردەم وەکو بولبول داوای گوڵ دەکەی ئەوا دیسان گوڵ جارێکی دیکە لەباغان هاتەوە، هەروەکو چۆن قومری تەمەنی خۆی لە دارو درەختە جوانەکانی باخچە بەسەر دەبات.

(٢) عەرسە: گۆڕەپانی حەوشەی ماڵ، جان: گیان، جانی جانان: گیانی گیانان.

سوارچاکی گۆڕەپانی مەیدان مەردی مەیدان هاتەوە یارو دولبەرو خۆشەویستی گیانم لەخزمەت گیانی گیانانم هاتەوە.

(٣) پیری روشن دڵ: شێخی دڵ و دەروون رووناک خاوەن کەشف و کەرامەت، خورشیدی تابان: رۆژی رووناک، نائب: جێگر، وەسمانی پانی: وەسمانی دووەم.

پیری تەریقەتی دڵ و دەروون رووناک ئەوە هاتەوە هەر دەڵێی رۆژی رووناکە ئەوەش جێنشینی دەبێت عثمانی یەکەم عثمانی کوڕی عفان بێت هی دووەمیش شێخ عیمان سیراجەددین تەوێلە بێت، ئەمەش بەسامانێکی زۆری بەرەکەتدا هاتەوە.

(٤) موعەتەر بو: بۆن خۆش بوو، پیراهەنی یوسف: کراسەکەی یوسف، کەنعان: مەبەست دەستی کەنعان کە یوسفیان تێدا بزرکرد.

وا هەموو دڵ و دەماغ بۆن خۆش بوون بەهاتنی بە پیرە بەبەرەکەتە نسبەتی ئەو بۆنە هەروەکو نیسبەتی کراسەکەی یوسفە کاتێك بۆباوکی نارد کاتێك باوکی یوسف کراسەکەی پێگەیشت گووتی﴿ وَلَمَّا فَصَلَتِ ٱلۡعِيرُ قَالَ أَبُوهُمۡ إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَۖ لَوۡلَآ أَن تُفَنِّدُونِ﴾

بـــۆ ئیفـــادەی نەشـــری فـــەیزی لوتـــف و بـــۆ ئیرشـــادی دیـــن
وا لەقەســـــری عارفـــــان یـــــەنبوعی عیرفـــــان هاتـــــەوە[1].
غونچـــــە سەرپۆشـــــی لـــــەروو لادا بەعـــــەزمی دیـــــدەنی
بولبـــولی تـــەبعی منـــیش بۆیـــە غـــەزەل خـــوان هاتـــەوە[2].
سەرخۆشـــی کـــاس الکـــرم سەرمەســـتی ســـەهبای قـــەدەم
باشـــکوە و بـــا حەشـــەم، مـــەجزوبی رەحمـــان هاتـــەوە[3].
مـــودەتێ بـــۆ ئـــەم هـــەوارە بـــێ ســـەداو هـــاوار بـــوو
تـــا بەجەزبـــەی حـــەق بەســـائی نـــەی بـــە ئـــەفغان هاتـــەوە[4].

---

(یوسف: ٩٤).

(١) ئیفادە: فیز، وەڵام دانەوەی ئەو کەسەی پرسیاری لێ دەکرێت، فـەیز: بـەهرە، ئـاوی زۆر، ئیرشاد: رێگا پێشاندەر، عارف: خواناس، نەشر: بڵاوکردنەوە.

بۆ وەڵام دانەوە بڵاوکردنـەوەی بـەهرەی لوتـف و رێگـا پێشـاندانی ئـایین وا دڵـە قەسـری خواناسان سەرچاوەی خواناس هاتەوە.

(٢) غـەزەل: جـۆرە شـعرێکە لـەرووی رووخسـارەوە لەسـەریەك کێشـی عـەروزو و یـەك قافیـە لەنێوان حەوت و دێرو یازدە دایە.

غوچە دەمی کرایەوە ئەو سەرپۆشەی لەسەری بوو فرێیدا بەنیازی دیدەنی کردنـی بولبـولی تەبعی منیش کاتێك دیتی غونچە کرایـەوە ئـەویش لەخۆشـیاندا دەسـتی کـرد بـە خوێنـدنی غەزەل گووتن.

(٣) هەر بەیادی جاران و پێشان سەرخۆش و مەستی پیاڵەیەکی شەرابی ئەوم کە ببینم کـەرەم بکات هەتا سەرخۆش و مەست بم کەس و کاریش با گلـەیی و گازانـدە بکـەن ئـەو عەشق و سەودا سەری خوای گەورە هاتەوە.

(٤) جذبە: حاڵ لـێ هـاتن سۆفییەکان لـەکاتی خواپەرسـتی حاڵیـان لـێ دێـت، سـەدا: دەنـگ، ئەفغان: ئاهو ناڵە.

ماوەیەك بوو ئەو شوێن و هەوارە بێ دەنگ بوو تاکو بەحاڵ لێهاتی حـەق راسـتی بـەدەنگی نای بەئاهو ناڵەی هاتەوە.

خاتری موخلیس بە دیدارت وەکو تەبعی (حەریق)
غونچەی مەقسوود پشکوتووە بە خەندان هاتەوە[1].

هێندە بێزاری کە زانیومە بەزاری نایەوە
دوور لە بالاکەت سەرینی نائومێدیم نایەوە[2].

بولبولێکی خۆش نەوا بووم بۆ نەوای دەوری گوڵت
کێ وەکو هودهود حیکایەتی سەبای گێڕایەوە[3].

---

(١) بۆ خاتری دڵسۆزیت ئەوا جارێکی دیکە بەدیداری تەبعی حەریقی گەیشت چونکە غونچە بەمەبەستی خۆی پشکوتووە بۆنەوەی دەم بە خەندە هاتەوە.

(٢) زانیومە کەتۆ گەلێك بێزاری بریاری نەهاتنەوەت داوە، هێندە ئاسان نییە کە تۆ تەنها بەقسەیەك کە لەدەم دەربێت بێیتەوە، منیش دوور لەبەژنوبالآت بەنائومێدی سەرم نایە سەر بالیف.

(٣) نەوا: دەنگ و ئاواز، هودهود: پەپوسولەیمان مەلێکی جوانە، حکایەتی سەباو: لەقورئانی پیرۆزدا ئەو بەسەرهاتە هاتووە ﴿وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيْرَ فَقَالَ مَا لِيَ لَآ أَرَى ٱلْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ ٱلْغَآئِبِينَ ﴿٢٠﴾ لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَاْذْبَحَنَّهُۥٓ أَوْ لَيَأْتِيَنِّي بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٢١﴾ فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ ﴿٢٢﴾ إِنِّي وَجَدتُّ ٱمْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ ﴿٢٣﴾ وَجَدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ﴾ (النمل: ٢٠-٢٤).

کەسێکی خۆش خوان بوو وەکو بولبول بەدەوری گوڵت دەمخوێند، ئایا کەس هەیە وەکو هودهود (پەپوسولەیمان) بەسەرهاتی شاژن بەلقیس کەشاژنی سەبەو بوو بەسەرهاتەکەی بۆ حەزرەتی سلیمان بگێڕێتەوە.

بــۆ پیاڵــەی مــەیلی لــەیلا قــەلبی مــەجنون قابیلــە
شۆڕشــی شــیرین لەناڵــەی کوهکــەن فامایــەوە[١].

حــەیفیٚ هێنــدەت دەربــەدەر کــرد دڵ لــەئیقلیمی ویســاڵ
شــیری منــداڵیت بــەژەهری هیجرانــت هێنایــەوە[٢].

بــۆ کــەناری ســەوزەی دەوری گــوڵی رووت شــین ئەکــەم
خــاکی کــوی عیشــقت بــە بیزنگــی ســەرم بیژاوەیــە[٣].

---

(١) مەجنون: قیس عامری لەبەنی عامر دەگێڕنەوە لەمنداڵیەوە لەیلای ئامۆزای خۆشویستووە، بەڵام دایك و باوکی رازی نەبووینە لەیلای بدەنیٚ، قـەیس شـێت دەبێـت روو دەکاتـە بیابـان لەگەڵ گیانلەبەراندا دەژی، لـەیلی لەبـەر دووری مـەجنون نـەخۆش دەکـەوێت و دەمرێـت، کاتێك مەجنون بەو هەواڵە دەزانێت خۆی گەیاندە سەرگۆڕی لیلی گەلێك شیعری بـۆ گـووت و شین و زاری بۆ کرد تا گیانی دەرچـوو، لـەنزیك دولبەرەکـەی بـەخاك سـپێردرا، لـەبارەی سەردەمەکەی گووتراوە، ساڵانی ٦٥-٦٨ی کۆچی بووە.
قابلە: شایستە، شـیرین: دولبـەری فـەرهاد، کوهکـەن: کێـو هەڵکەنـدن مەبەسـت فـەرهادە قارەمـانی ناسـراوی داسـتانی خوسـرەو و شـیرینە، زۆر شـەیدای شـیرین بـوو، بـەڵام بەئارەزووی خۆی نەگەیشت دوای ئـەوەی کـەکێوی بێسـتوونی لـەپێناو شـیریندا هەڵکەنـد، فەرهەنگی دیوانی شاعیران (سالم، نالی، کوردی) د. محمد نوری پیاڵەیەك بەدەستی لـەیلی شایستەی دڵی مەجنونە هەروەکو ئەو شۆڕشەی لەپێناو شیریندا کرا کـە هەڵکەنـدی کێـوی بێستوون بوو.
(٢) ئیقلیم: هەرێم.
بەشیرو هێز هێندەت ئاوارەو دەربەدەر کرد لـە هـەرێمی دڵ و دەروون پێـت نەگەیشـتن جـا لەتاو دووری ئەو شیرەی لەمنداڵی خواردبوون هەموو بووە ژەهرو هێناتەوە.
(٣) کەنار: لەباوەش گرتن.
بۆ لەباوەش گرتنی هەر سەوزایی هەیە کە دەوری گوڵیان داوە شین و واوەیلا دەکـەم خـاك و خۆڵی گەڕەك و کۆڵانەکانی عیشقت بە بێژینگی سەرم بێژینگ ئەکەم.

کەوتووە سەر خەرمانی عومرم ئاگری تولی ئەمەل
سەد کەرەت بارانی وەعزی لێ درا نەکوژایەوە[١].
شیری ئەبرۆ تیری موژگان تاق و جووت ئەنوێنێ پێم
تابزانم روحی شیرینت چلۆن کێشایەوە[٢].
جێی نەزەر بوو حاشیەی زوڵفت لەسەر ئایاتی رووت
زۆر موتالاّم کرد وەکو دەورو تەسەسول مایەوە[٣].
تاقی هیجرانی برۆت جێی نازە بۆ ئەهلی نیاز
سوفی وابزانێ کچە هێندە کەر بوو خۆی گێرایەوە[٤].

---

(١) خەرمان: بەدەست هێنانی ئارەزوو، تولی ئەمەل: زیادبوونی هیواو ئاوات.
زیادبوونی و درێژبوونی هیواو ئاواتم کەوتۆتە سەر بۆ بەدەست هێنانی تەمەنی زیاتر تەمەن گەر بێتو سەد جاریش بارانی بەندو ئامۆژگاری بکرێم بێ سوودە ئەو ئاگرەی لەدەروونم پەیدابووە ناکوژێتەوە ئەو هیواو ئاوات و درێژبوونە لەدڵم ناچێتەدەر.
(٢) شیر: شمشێر، تیری موژگان: مووی برژانگ وەکو تیرە.
شیری ئەبرۆی کە کەوانەو مووی برژانگەکانیشی هێندە تیژن هەروەکو تیر وایە جارجار هەردووکیان پێم نیشان دەدات و جار جاریش بەتەنها یەکێکییان هەر بۆ ئەوەیەتی کەبزانم روحی شیرین چۆن و بەچ شێوەیەك دەکشێتەوە لێم.
(٣) نەزەر: جێگای بایەخ پێدان، حاشیە: قەراغی شت وەکو جل و بەرگ یان کتێب کە شەرحی مەتنی بۆ دەکرێت، موتالا: خوێندنەوە، دەور: پیاچوونەوە، تەسەسول: زنجیرەیەك لەدوا یەك.
جێگای بایەخ پێدان بوو قەراغی زوڵفت چونکە ئایەت و نیشان هەبوو لەسەر رووت، لەرووت شت دەخوێنرایەوە بەڵام من گەلێك لێی ورد بوومەوەو خوێندمەوە هیچی لێ حاڵی نەبووم بۆیە وەکو خۆی بەریزبەندی و یەك لەدوای یەك مایەوە.
(٤) میحرابی برۆت: مەبەست ئەبرۆی کەوانە، ئەهل نیاز: ئەوکەسانەی داوای مراز دەکەن.

شەمعی خوبان پرتەوێکە شەمسی رووی تۆی لێ کەوت
هێندە حەیاو شەرمی بەخۆیە بەجارێ توایەوە[1].

گوڵ بژێرێکە زەریفم کرد لەنێو باخی خەیاڵ
خۆزگە مەردێکی رشید بۆ شێخی بخوێندایەوە[2].

---

ئەبرۆی کەوانت بۆتە جێگای خەڵکی و دێن داوای مرازی خۆیان دەکەن، سۆفی وای هەست کرد باسی کچ دەکرێت لەوەش سەیرتر خۆی ئەو باسەی گێڕایەوە.

(١) خوبان: شۆخ و شەنگ، شەمع: مۆم، پرتەو: گەشانەوە، شەمس: رۆژ.
شۆخ و شەنگی مۆم پرتەوێك بوو لەئەنجامدا رووی گەش و جوانی تۆی لێکەوتەوە هەردەڵێی رۆژە هێندە بەشەوقە جا بۆیە مۆم کە ئەوەی دیت شەرم و حەیای بەخۆ بوو لەشەرماندا توایەوە.

(٢) لەنێو باغی هیواو ئاواتەکانمدا بژێرێکی زۆر جوان و زەریفم کرد، جا خۆزگە کەسێکی مەرد دەهاتە مەیدان ئەو گوڵ بژاردەیەم بۆ شێخی دەگێڕایەوە.

بـــەنی ئـــادەم خـــوا وای کـــردووە رۆژێکـــی تامـــاوە
سەراسـەر عـومری سـەرفی سـەرف نـەحوی زەرف تیامـاوە[١] .
مـــەداری تـــولی ئومێـــدم خـــەیاڵی گـــەردن و زولفـــە
بـەلی سـەودا سـەری عاشـق لەسـەر هەودایـەکی خـاوە[٢] .
بیســـتانی پەرچـــەمی ئاشـــقە ســـەرگەردان و ژولیـــدە
بەمیســلی زوڵفــی ســونبول دڵ هەمیشــە حــاڵی شــێواوە[٣] .
هــەوای تافــەی غەزالــە رێــی خوتــەن تووشــی خــەتای کــردم
بــەیادی موشــکی زوڵفــی روم لەچــینی پەرچــەمی مــاوە[٤] .

---

(١) سەراسە: سەرتاپا، عومر: تەمەن، سـەرف: خـەرجکردن، زانسـتی صـرف، نـەحو: زانسـتی ئیعراب، زەرف: قاپ و قاچاخ.
خوای گەورە وای کردووە هەتا ئادەمیزاد رۆژێکی لـەدنیادا مـابێ سـەرتاپای تەمـەنی خـۆی سەرف دەکا بۆ فێرکردنی خۆی هەروەکو چۆن بەدرێژایی تەمەنی کەسابەتی دەکات هەموو بۆ ئەوەیە کە بیکاتە خواردن و لەناو قاپ و قاچاخی بکات.
(٢) مەدار: جێگای سوڕانەوە، تولی ئومێد، بەدرێژی ئومێد، سەودا: ئارەزووی زۆر، هەودا: تـاڵ تاڵی موو.
جێگای سوڕانەوەی ئومێـدم هـەردەم لەخـەیاڵی گـەردەن و زوڵفـی یـارە بـەڵی ئەوکەسـەی ئارەزووەکی زۆری عاشق لەسەر تاڵ تاڵی مووی زوڵفی خاوی یارە.
(٣) ئاشوفتە شێواو: پەرێشان، ژولیدە: لێقەوماو، سونبول: گوڵێکی بۆن خۆشە.
پەرچەمی یار شێواو و پەرێشانە سەرگەردان و خەمگێن لێقەوماوە هەروەکو گوڵی سـونبول زوڵفەکانی بۆنی خۆشە جا لەبەر شێواوی زوڵفی دڵی منیش حاڵی پەرێشان و شێواوە.
(٤) نافەی غەزال: ناوکی مامزی و لای موشـک، خوتـەن: ناوچـەیەکە لـەباکووری چـین، موشـک: مەبەست لەو ناوچەی موشکە لەباکووری وڵاتی چین، چین: ریز.
ئارەزووی گرتنە رێگای وڵاتـی خوتـەنم کەوتـە مێشـکی بـۆ بەدەسـت هێنـانی بـۆنی موشـک کەهی مامزەکانی وڵاتی خوتەنە ئەمەش وای کرد کە تووشی گوناهی کردم، جا هەر بـەیادی ئەمەوە زوڵفی بۆنی موشکی لێ دێت و لەچین چینی پەرچەمی ئەوبۆنە هەرماوە.

چـراغی عـومری عاشـق بـای فـەنای هیجرانـی لـێ هـەڵ بـوو
لەفانووسی ئەدەبدا حیفـزی کـە یـەک دوو نەفەسـی مـاوە[1] .
دەمێکــە چــاوەڕێی ســوورمەی غوبــاری موقــەدەمی یــارم
لــەکوی خوبانـــەوە ئـــەمڕۆ نەســیم تـــۆزێکی هێنــاوە[2] .
کتــێبی عیشـــقی مـــەجنون ئایـــەتی رووخســـاری لەیلایـــە
لەســـوڕەی یوســـفا دەرســـی جنـــونی ئێمـــە نووســـراوە[3] .
ســـەرم کاســـەی شـــەرابی ســوحبەتی کاسـەی دڵــی غــەیرە
لــەدەردی دەردی ئــەم جامــە پــەنام بــۆ ســاقی هێنــاوە[4] .

---

(١) چراغ: چرا، فەنا: لەناوچوون، حیفز: پاراستن.
هەرچی رووناکی و چرای تەمەنی کەسی عاشق هـەموو بـەبای لەناوچوون و لێك دابڕانـەوە لەناوچوو فەوتا جا کەوایـە لـەنێو رووناکی فانووسدا کـە ئـەدەب هـەموو بپارێزە چونکە هەریەك دوو نەفەس ماوە.
(٢) سورمە: کل-مادەیەکە لەچاو دەکرێت و چاوی پـێ رەش دەکرێـت، غوبـار: تـۆزو گـەرد، مقدم: کات هاتن، خوبان: جوان، نەسیم: شنە.
ماوەیەکە چاوەڕوانی ئەوەم کە ئەو تۆزو گەردەی لەژێر پێی یارەوە هەڵدەستێ کـە دەڵێـی کلە لەچاو دەکرێت جا لەبەر کوی ئەو جوان و شۆخ و شەنگ شنەبا هەندێکی لەگەڵ خۆیدا هێناوە.
(٣) کتاب: بەسەرهات، مەجنون: عامری قەیسی، سورە: وێنە، یوسف: کوڕی یعقوب پێغەمبـەر سەلامیان لێ بێ، مجنون: شێت.
لەبەسەرهاتی خۆشەویستی مەجنون لەروخسـاری لـەیلای خۆشەویسـتی رەنگـی داوەتـەوە لەوێنەی جوانی یوسفیشدا باسی بەسەرهاتی شێتی ئێمە نووسراوە.
(٤) کاسە: جام، سوحبەت: قسە، غەیر: خەڵکانی بێگانە.
سەرم بۆتە کاسەی شەراب خەڵکی شەرابی تێدا دەکەن لەگـەڵ مەسـتی ئەوکەسـانە قسـەو باسی من بۆتە مەزە لەگەڵ شەرابدا دەیخۆنەوە جا لەبەر دەردی ئەو جامە شەرابە داوام لە مەیگێڕ کردووە بۆئەوەی پەنام بدا.

کەسێ فیترەت بڵندبێ بۆ رەواجی سکەی دینی
خەراجی مصری قەلبی خۆی بەحوسنی یوسفی داوە[1].
لەسەر سەودای قوماری شاهـ خوبان پیری بورهانی
بەچۆگانی ئیرادەت گوی سەرم بۆ بازی داناوە[2].
نیراح و روح و حەیاتی من بەجلوەی ساقی یە باقی
نەوەك وەك سپلە بۆ سفرە لەدوی نان چاوی پڕئاوە[3].
بەقوربانت بم ئەی پیری خەراباتی جیهان ئاباد
بەشاهیدبە کەوا روحم لەرەهنی قوربی تۆ ناوە[4].

---

(١) فیترەا: سروشتی، رەواج: برەوپێدان، خەراج: باج، حوسن: جوان.
هەرکەسێك ئەگەر بێت سروشت و ئەخلاقی بەرزی هەبێت ئەوەندە دەهێنێ کە برەوی پێ بدەی بەشتی بزانێ ئەی ئەوەنییە هەرچی باج و موڵکی وڵاتی میسر هەیە گۆڕیویانەتەوە بەجوانی حەزرەتی یوسف سلاوی خوای لێ بێت.

(٢) سەودا: ئارەزوو مەیل، شاهـ خوبان: شای جوانان، پیری بورهان: پیرو شێخی بورهان، کە شاعیر سوفی ئەو پیرەبوو، جۆگان: گۆپاڵ، ئیرادەت: خۆ بەکەمزانین لە دڵسۆزی و خۆشەویستیدا.
لەسەر ئارەزوو مەیلی شای جوانان کە شێخ بورهانە کە چۆن پەنای بەو گۆپاڵە دەدات و پێوەی دەڕوا منیش بۆ بەربونەوەی خۆم دەکەمە بەردەبازو بەسەرمدا بپەڕێتەوە.

(٣) نیزا: پاڕانەوە، جلوە: خۆپێشاندان، ساقی: مەیگێڕ، باقی: ماوە، سپڵە: بێ وەفا، سفرە: خوان: چاوپڕ لەئاو: چاو پڕ لەفرمێسك.
پاڕانەوەی روح و گیانی من هەر بەساقی ماوە کە خۆی بەمن پێشان دەدات و دەبێتە هۆی ئارامی دڵ و گیانم و خۆشی بەخشی روحم، نەوەك وەکو کەسێکی بێ وەفا هەر بەدوای سفرەو خواندا بگەڕێت و بۆ نانێك بگری و فرمێسك بڕێژێ.

(٤) خەرابات: مەیخانە لەوشەی (خربات)ی عەرەبی هاتووە بەمانای کاولگە، بەڵام لەئەدەبی سوفیزمدا لەناوچوونی خورەوشتی نەفس خراپ جێگەی خواپەرستان، کەسی خەرابات بۆ کەسێك دەگووترێ کە گەیشتبێتە پلەی بەرزی خواپەرستی، ئاباد: ئاوەدانکردنەوە، رەهەن: دانانی شتێك لەجیاتی ئەو پارەیەی بەوقەرز وەردەگیرێ.

شا مولکی یەقین شاهنشە دین پیری با تەمکین
رەئیسی ئەولیا رەحمی هەتا دڵ رێی نەبەستراوە[١].
لەدار الحوزنی میحنەت ناجێیە وەك پیری کەنعانی
بەبوی پیراهەنی یوسف کەسێ چاوی هەڵێناوە[٢].
حوزوری تۆ بەهەشتی ئادەم و دڵی ئەهلی حەسەد شەیتان
بەبوی دانە تەمەع کێشاویەتە ناو دامی دنیاوە[٣].

---

بەقورابانت بم ئەی ئەو پیرەی کەهەموو خۆشەویستی دنیات وەلاناوە و گەیشتوینە پلەی بەرزی خودا پەرستی هەموو دنیات بەنووری خۆت ئاوەدان کردۆتەوە، جا وەرە بەشاهیدبە کەوا هیچ شتێك لەروح خۆشەویستتر نیە ئەوە لەرەهنی تۆ داناوە.

(١) تەمکین: توانا، رەئیسی ئەولیا: سەرۆکی پیاوچاکان، یەقین: بڕوای تەواو.
ئەی ئەوکەسەی کە بڕواو یەقینی تەواوت هەیە بەو هۆیەوەش بوویتە خاوەنی هەموو بڕوای تەواو ئەو کەسەش شاهەنشایە ئەو پیرە بەتوانایە سەرۆکی هەموو پیاوچاکان رەحمێ بکە هەتا رێگای دڵ و دەروون نەبەسترایە.

(٢) دار الحوزن: لەئەدەبی کلاسیکی کوردی مەبەست مالی حەزرەتی یعقوبە، میحنەت: دەردوبەلا، پیری کەنعان: مەبەست حەزرەتی یعقوبە سلاوی خوای لێ بێت، پیراهەن یوسف: کراسی یوسف.
لەخانەی خەم و خەفەت دەردو بەلادا وەکو حەزرەتی یعقوب کە کەوتە ناو جێگاو چاوەکانی کوێربوو لەتاو یوسفی کوڕی بەلام ئەوکاتەی یوسف کراسەکەی بۆ ناردو بەسەر چاویدادا روناکی بۆ چاوی گەڕایەوە ﴿ٱذْهَبُوا۟ بِقَمِيصِى هَٰذَا فَأَلْقُوهُ عَلَىٰ وَجْهِ أَبِى يَأْتِ بَصِيرًا وَأْتُونِى بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ﴾ (یوسف: ٩٣).

(٣) حوزور: ئامادەبوون، دامی دنیاوە: جوانی و رازاوەکانی دنیا.
ئامادەبوونی تۆ وەکو ئامادەبوونی ئامادەمە لەبەهەشت هەروەها دڵ و دەروونی کەسانی حەسوود وەکو شەیتانە جا بەبۆن و بەرامەی تەماعی دنیاوە رایکێشاونە نێو جوانی رازاوەکانی و خۆشی و لەزەتی دنیاوە.

شــەرابی ســوحبەتت ئەکســیری خــالی مەعــدەنی روحــە
لەکارخانـــەی ســـەعادەت لوقمـــەی لوقمـــانی نـــاوە[١].
عــەدو بــا هــەروەکو عــەقرەب بــەکلکی نیشــی خــۆی دانــێ
شــوکر تــۆزێ حــەیای بــوو وا بەچــاویا دیــارە داینــاوە[٢].
هــەتا گــوێی پێــوە بــوو مــونکیر لــەزەلکاوی حەســادەتدا
هــەزاری کلکــی بگــرێ کــەلکی نــاگرێ تــازە خنکــاوە[٣].
وەکــو پەروانــە بــۆ شــەمعی جــەمالی تــۆ (حــەریق) ئــەمڕۆ
چــرای شــەوقی بگیرێــت تــەیبت خۆشــی هەڵســاوە[٤].

---

(١) شەراب: مەی، سوحبەت: قسەکردنە، ئیکسیر: مادەیەکە شت دەگۆڕێت وەکو گۆڕینی مس بۆ زێڕ، کارخانە: کارگە، سەعادەت: خۆشی و بەختیاری، لوقمە: پارو، لوقمان: لوقمانی حەکیم.
قسەو گفتوگۆی دەم و لوتفت هەردەڵێی مادەی ئیکسیرە خەڵك دەگۆڕێت و دەیانهێنێتە سەر ڕێگای ڕاست هەروەها ئەو قسانەت خۆراکی گیانە لەو کارخانەش بەختیاری خۆشی دەست دەکەوێت هەروەکو ئەو ئامۆژگاریانەی حەزرەتی لوقمان کەمرۆڤ پەندیان لێ وەردەگرێت.
(٢) عەدو: دوژمن، عەقرەب: دووپشك، نیشی: ژەهر، حەیا: شەرم.
با دوژمن هەروەکو دووپشك پێوەبدات بەکلکی ژەهرەکەی خۆی بڕێژێ و بمکوژێ سوپاس دیارە تۆزێك شەرم و حەیای هەبوو چونکە ئێستا چاوی شۆڕە
(٣) مونکر: پیاوی خراپ.
هەتا پیاوی خراپ گوێی پێوە بوو بۆ وەرگرتن و قسە هێنان و بردن خنکابوو لەزەلکاوی حەسوودیدا ئاگای لەخۆ نەمابوو ئێستاش گەر بێتو هەزار جار کلکی بگری بێ سوودە کەڵکی نییە چونکە کار لەکار ترازاوەو خنکاوە.
(٤) پەروانە: پەپوولە، شەمع: مۆم.
وەکو پەروانە چۆن عەشقی چرای مۆمەو هەربە دەورووپشتی ئاگرەکەیدا دێت و دەچێت هەتا لێی نزیك دەبێتەوەو باڵەکانی لەئاگرەکە دەدات و خۆی دەسووتێنێ جا منیش وەکو ئەو پەپوولەیە عەشقی جوانی تۆم و گەر شەوقی چرایەکەشت بگری بەخۆشیت خۆش

موعتــادی فەلــەك دایمــە هــەر جــەورو جەفایــە

خــۆ خاســە لەگــەڵ ئــەهلی وەفایــان بــێ وەفایــە[١].

یــارەب رەقیــب تووشــی بــەڵاو دەردو غــەمی بــێ

بــەو دەردەوە بنــاڵێنێ هــەتا ڕۆژی جەزایــە[٢].

بــەو ریشــەوە ئێســتاکە رەئیســێکە لــەلای خــۆی

تەرکیزکــە تــەزویرە لەســەر دامــی خەتایــە[٣].

بۆماچــی دەمــی ســالیکە ســۆفی لــە ڕەهنــدا

ئیمــانی بــەخت کــردووە و شــوکر ماچــی نەدایــە[٤].

---

هەڵساوە.

(١) موعتاد: خووگرتن بەشتێك، جەورو جەفا: زوڵم و ستەم، خۆخاسە: خۆی دەگونجێنێ، فەلەك: گەردوون.

گەردوون خووی وا گرتووە هەردەم هەر زوڵم و ستەم بووە واهاتووە، هەرئەو گەردوونە سروشتی وایە خۆی دەگونجێنێ لەگەل خەڵكیدا بەڵام لەگەڵ کەسانی بەوەفا گەلێك بێ وەفایە.

(٢) رەب: خوا، رەقیب: دوژمن، رۆژی جەزا: رۆژی مەحشەر و لێپرسینەوە.

خوایە کەسانی دوژمن و ناحەز تووشی دەردو بەڵا و غەم و خەفەت بێت هەردەم بەو دەردو ئێش و ئازارەوە بناڵێنێ هەتا ئەو رۆژە دادێ کە لێپرسینەوە لەگەڵ خەڵکاندا دەکرێت و هەرکەس پاداشتی خۆی وەردەگرێتەوە.

(٣) تەرکیز: هەستت لەلای شتێك بێت، تەزویر: فرت و فێڵ، دام: تەڵە نانەوە.

بەو ریشەی کە هێشتینیەوە ئێستاکە بۆ خۆی سەرۆکێکە بەلای خۆیەوە ئەو بەبیر هێنانەوەیە کە فروفێڵە لەسەر دانانەوەی تەڵەی گوناهکردن.

(٤) سالیك: مورید پەیرەو کەری رێبازی سوفیزم.

سالیك و سۆفی ماچی دەمی خۆی لەرەهن دانا و ئیمانیشی بەخت کرد بۆ بەدەست هێنانی ماچێك کەچی سوپاس ماچێکی پێ نەدا.

زاهیـد مەکــە مــەنعم کــە دەکــەم وەســفی گــوڵی خــۆم
گـــوڵ غونچـــەی مـــن لایقـــە موشـــتەق لەســـەفایە[1].
هەرچـــەندە بەســـن تـــوفلی عـــاقلی قوربـــان
تێـــی هەڵـــدە بەشـــەق ئـــەکورە عـــەینی بەڵایـــە[2].
هـــەر شـــوکری خـــوا بێنـــە جـــێ تـــۆ کـــە (حـــەریقی)
رامـــالی رەقیـــب کـــە هـــەموو جـــەورو جەفایـــە[3].

---

(١) زاهید: خواناس، مەنع: قەدەغە، لایق: شایستە.
خواناس و پیاوانی خوا تکایە قەدەغەم مەکەن کاتێك وەسفی گوڵی خۆم دەکەم کە خۆشەویستەکەمە ئەو گوڵ خونچەیەی من شایستەی ئەوەیە وەسفی بکەم لەبەر ئەوەی ئو گوڵە وەرگیرایە لە پاکوخاوێنی و رووناکی.
(٢) بەسن: بەتەمەن، توفل: منداڵ، ئەکورە: خێل.
هەرچەندە تۆ بەتەمەن بچووك و منداڵی بەڵام شوکر بەعەقڵ کەسێکی کامل و تەواوی جا کەوایە ئەو خێلە بدە بەر شەق تێی هەڵدە چونکە بەڵایەکە بۆخۆی.
(٣) حەریق تۆ هەردەم شوکری خوابکەو شوکرانەی خۆت بێنەجێ باکەسی ناحەزو دوژمن هەموو رامالی چونکە هەموو زولم و ستەم و ناخۆشیە پێویستە ناحەز رامالین لەگەڵ رامالینی ناحەزو رەقیب ئەو جەورو جەنایەش نامێنێ.

لەقەیــدی زیــد و عــەمرانیم و دڵ یــا بەســتەیی تۆیــە
لەهــەر وەخــتێ ڕەهــابێ پــێ دەزانم ڕســتەیی تۆیــە[١].
دەبێتــە ئــیفتراو بوختــان ئەگــەر نیســبەت وەغــەیری دەم
بــەهاژەی زوڵفەکــەت زانــیم کــە مــاران گەســتەیی تۆیــە[٢].
سەراســەر ڕەخنــەی چــاوم نیشــانەی تــیری موژگانــە
لــەلای خــۆی چەشمەســارو ســەبزەی ئــەو ڕســتەی تۆیــە[٣].
حوبــابی ئەشــك و حەســرەت بوەتــە فنجــانی ســەرو ســینەم
لــەجێی دەســتەگوڵا لێــدەن ئــەڵێن گــوڵ دەســتەی تۆیــە[٤].
گلــێ بــێنی بەســەرماکەی، گــوڵێ بــێنێ بەســەر کــەی

(١) قەید: کۆت و بەند، ڕستە: داو، زەید و عەمر: لەحوجرەکان و دانەوەی قواعد نموونەیان بە زەید عەمر دەهێنایەوە.
من لە کۆت و بەندی زەیدو عەمر نیم و دڵیش بەتۆوە نەبەستراوەتەوە هەرکاتێك ڕزگارو ئازاد بوویت من ئەوە دەزانم داوی تۆیە و دات ناوەتەوە.
(٢) ئیفترا: قسەهەڵبەستن بەخەڵك، بوختان: لەپاش ملە باسی خەڵك کردن، هاژە: سەرلێ شێواو، ماران گەست: یەکێك فێڵ لەیەکێکی دیکە بکات دەڵێن مارانگەستە.
هەر قسەیەك بکەم دەبێتە قسە هەڵبەستن قسەو باسکردن دەربارەی تۆ ئەگەر نسبەت بە غەیری دەم بدەم چونکە دەزانم بەشێواوی زوڵفەکەت شێت و شەیدا بووە بەشێواوی زوڵفت مار گەزیویەتی.
(٣) سەراسەر: سەرتاپا، چەشمەسار: شوێنێك کانیاوی زۆری لێ بێت.
سەرتاپای ڕەخنەی چاوم ئەوە ماوەیەکە چاوم بۆتە نیشانە مووە باریك و تیژەکانی برژانگەکانتە چونکە ئەو لەلای خۆیە چاوەکان بۆتە جێگای کانیاو سەرچاوە جا بەئاوی ئەو سەرچاوەو کانیاوانە سەوزایی نەورستەیی تۆیە.
(٤) حوباب: بلقی سەرئاو، ئەشك: فرمێسك.
فرمێسکی چاوەکان و ئاهو حەسرەت وەکو بلقی سەرئاوی لێهاتووە کاتێك ئەو فرمێسکانە لەفنجانی سەرو سینەم دەکرێت جا کەوایە دەستەگوڵ لێدەن دەڵێن تۆ وەکو دەستە گوڵی.

غــەم و شــادی ســەرپا هەرچــی بــێ وا بەســتەیی تۆیــە[1].
دڵــم ئیشـەی شــەرابی رووتــە ســـرکەی غــەیری گەرتێکــەم
گــوڵاویش بــێ گــلاو بــێ شیشــە چــۆن بەربەســتەیی تۆیــە[2].
شکســتەی دەســت بەســتەی چــاوەکەم جــەبری لــەلای تۆیــە
مــەلێ کەســرە بەشــانم چــۆن شکســتەو بەســتەی تۆیــە[3].
تـــەنافی زولفەکـــەت لادە خـــەیابانی خـــەیاڵم راســـت

(١) گڵ: خۆڵ، وابەستە: بەتۆوەیە.
خۆڵ بهێنە بەسەرماکەو پاشان گوڵ بهێنە سەرماکە، غەم واتە گل بەسەردا کردن کاتێك مرۆڤ غەم دەیگرێ دەڵێ خۆڵی بەسەرداکردووە، کاتێکیش شادی دەیگرێ و شادی بەسەردا دێت هەردەڵێی گوڵە دەگەشێتەوە، جا هەر چییەك بێت هەموو بەتۆوە بەستراوەتەوە.

(٢) شیشە: شوشە، سرکە: شلەیەکی ترشە لە ترێ و هەنار دروست دەکرێت، گوڵاو: ئاوی گوڵ بۆنێکی خۆشە.
دڵم بۆتە شوشە رووی جوانی تۆش وەکو شەراب وایە دیارە شەرابیش لەشوشە دەکرێت واتە هەرکاتێك تۆ دەبینم دڵم شاد دەبێت جا کە سرکەی ترشی خەڵکی تێ بکەم، ئەو سرکەیە گوڵاویش بێت دیارە هەر سوودی نابێت چونکە گەر شووشە نەبێت گوڵاو لەچ بکرێت!

(٣) شکستە: شکان، جەبر: دەست گرتنەوەی دەستی شکاو، کەسرە: غەم و خەفەت.
دەستم بەهۆی تۆوە شکاوە چاوەکەم ئەو دەستە شکاوەم هەر بەدەستی تۆوە چاك دەبێتەوە هەرگیز مەڵێ غەم و خەفەت بەرۆکی گرتووم چۆن ئەو شکانە بەمن بەستراوەتەوە.

بـەباڵای سـەروی مـەوزون و قـەدی بەرجەسـتەی تۆیـە [١].
ئـــەتبیا حـــەبیان مـــەسموم و دانـــە حـــەبیان پووچـــە
ئـەوە مەغزێکــە بــێ ئـەمرو رەهــانی بەسـتەی تۆیــە [٢].
بەئومێـــدی دەوا بـــوو لـــەزەتی دەوری دڵـــم دەردیـــە
ئـەزانم چـۆن گوسـتەی تـۆ هـەموو پەیوەسـتی تۆیـە [٣].
ئەگـەر دەردت نەدایــە نیسـبەتت چـۆن ئـەبوو دەرمـانم
هەرکەسـێ بـێ بڵـێ قوربـان (حـەریقی) خەسـتەی تۆیـە [٤].
خـــەونم لـــەخوا چـــونکە لەبـــەر غـــەیری خوایـــە

---

(١) تەناف: رستە جلی لەسەر هەڵدەخەن، خیابان: شەقام، سەروی مەوزون: بەژن و باڵای رێك و پێك، قەد: کەمەر.
زوڵفت وەکو تەناف بەسەر رووتدا هاتۆتە خوارەوە جا ئـەو زوڵفـە لادەبـا راسـتە شـەقامی خەیاڵم هەردەم بەستراوەتەوە بە بەژن و باڵای رێك و پێکت کـە ئـەو بـەژن و بـاڵا جوانـەت لەخەیاڵم بەرجەستە بووە.
(٢) ئەتبیا: کۆی تەبیبە پزیشك، مەسموم: ژەهراوی.
پزیشکەکان چارەوسەریان کە بریتییە لە حـەب ئـەوە چارەسـەرنییە بـەڵکو ئـەوە ژەهـرەو کوشندەیەو هەر دانەیەك لەو حەبە پـووچ و بـێ کەڵکـە ئـەوە مێشـێکە بـەبێ ئەمروفـەرمان رێگای تۆی گرتۆتەبەر چونکە بەتۆوە بەستراوەتەوە.
(٣) دەوا: دەرمان.
دەردی دڵـم گـەلێك گرانـە بۆیـە لـەزەتی ئـەو دەردەم هـەر دەردە سـەریە جـا بـە ئومێـدی دەرمـان بـوم کـەتۆی بـەڵکو لـەو دەردە رزگـارم بێـت، چـونکە دەزانم ئـەو دەردە بـەهۆی تۆوەیە.
(٤) نیسبەت: شتێك بخرێتە پاڵ شتێکی دیکە.
ئەگەر تۆ هۆی دەردی من نەبی چۆن دەبوو ببیە دەرمانی من کەواتـە مـن نەخۆشـی تـۆم و هەرتۆش دەرمانی منی نیسبەتی دەرد دراوەتە پاڵ دەرمان، جا هەرکەسێك بابێت و بڵێت حەریقی نەخۆشی دەستی تۆیە.

دیمـــەنم بـــەد روو ســـورەت وەک خـــەوف و رجایـــە[1].

پـــالی رەحـــەتی داوەتـــەوە نەفســـی خەسیســـم

یـــا ئـــەمنی غینـــا یـــا ئەســـری یـــەئس و هەوایـــە[2].

گـــەر تالیـــب بـــوو یوســـف خـــۆت نەفســـی عـــەجوزە

زوو بێنـــە دە زوو بێنـــە دەڵـــێن ئـــەهلی وەفایـــە[3].

ئینکـــاری ســـیرایەت مەکـــە ئـــەی مـــونکری مـــوفلس

---

(١) خەوف: ترس، رەجا: پاڕانەوە.

لەبەر ئـەوەی ترسـانم لـەخوا بـۆ غـەیری خوایـە بۆکەسـانی دیکەیـە، ئـەوەش وای کـردووە شێوەو دیمەنم بەدو خراپ بێت وێنە وەك ئەوەیە ترس و لەخوا پاڕانەوە بێت.

(٢) خەسـیس: پـیس، ئـەمنی غینـا: ئاسایشـی و دەوڵەمـەنـدی–دڵخۆشـی و گـۆرانی، ئەسـەر: شوێنەوار، یەئس: نائومێدی، عەجوز: پیر.

نەفسی پیس و ناپاکم زۆر بەئیسراحەت پاڵی داوەتەوە چونکە مـن ئامـادەم ئارەزووەکـانی جێبەجێ بکـەم جـا ئـەو ئیسـراحەتیە بـۆ ئەوەیـە کـە هـێمنی و ئارامی خۆشـی یـە یـاخود شـوێنەواری نائومێـدی و کـەیف و سـەیف و رابواردنـە (نەفسـی خەسـیس ئاماژەیـە بـۆ سوورەتی یوسف ﴿إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ﴾ (یوسف: ٥٣).

(٣) تالب: داواکار، یوسف: حـەزرەتی یوسـف کـوڕی یعقـوب، نـەفس عجـوز: نەفسـی پـیر، زوو بێنە: خێرا بهێنە، دە زوو بێنە: داوو دەرزی.

گەر تۆ داواکاری یوسـفی و کڕیـاری ئـەی نەفسـی پـیرو بـێ کـەڵك دەزووکـە خێراکـە بهێنـە چونکە ئەوکەسەی تۆ کڕیاری ئەوە کەسێکە ئەهلی وەفایە.

عەجوز دەکرێت مەبەستی ئەو پیرەژنە بێت کاتێك حەزرەتی یوسفیان دەفرۆشـت لـەبازاڕی میسر ئەو پیرێژنە هات کلافەیەك داوی پـێ بـوو کـە بـەو کلافـە داوە یوسـف بکڕێـت بـەڵام نرخی یوسف لەوە گرانترە.

بـــێ ســـەیری قەمەرکـــە، چـــە بەشـــەوق و بەزیایـــە[1].
مـــونکر بـــە مەســـەل شـــەپپەرە بـــێ نـــوری هیدایـــەت
خـــۆی تـــالبی زولمـــەت بـــو خـــودا نـــوری نەدایـــە[2].
هـــەر مەزبەلـــە، هـــەر مەشـــعەلە، جێـــی پرتـــەوەی شەمســـە
یـــەک جێگـــەیی فـــەزل، یـــەکێ جێگـــەی فوزەلایـــە[3].
تێفکـــــرە لـــــە ئـــــەجزایی عەناســـــیر بەتەبیعـــــەت
یـــەک مـــاییلی مەرکـــەز، یـــەکێ مایـــل بەهەوایـــە[4].
بـــارانی بەرەحمـــەت لەتـــەرەف مەبـــدەئی فـــەییاز

---

(١) ئینکـار: حاشـا، سـیرایەت: شـەو رەو، بڵاوبوونـەوەی شـت، قـەدەر: مـانگ، بەزیایـە: پرشنگدارە.
حاشا لەشەو رۆیشتن مەکە ئەی ئەوکەسەی کە هەربـەدوای خراپـەدا دەگـەڕێی هـیچ شـتێك شـك نابـەی و نیتـە وەرە سـەیری مـانگ بکـە و بزانـە چـەند بەشـەو گـەش و جـوان و پرشنگدارە.
(٢) مونکر: کاری خراپ، مەسەل: وەکو، پەپپەر: شاپەڕی باڵندە.
کاری خراپ و نابەجێ کەکەسـانی خـراپ ئـەنجامی دەدەن هـەروەکو شـاپەڕی باڵنـدە گـەر بێتو نووری هیدایەتی لەگەڵدا نەبێت، چونکە خۆی بەدوای کاری خراپ دەگەڕا بۆیـە خـوای گەورەش هیچ تروسکایەك نووری پێ نەبەخشی.
(٣) مەزبەل: زبڵدان، مەشعەل: شوێنی چرا داگیرساندن چرادان، پرتەو: بلێسە، شەمسـە: رۆژ- کورتکراوەی ناوی شێخ شەمسەددین.
هەر جێگای زبڵدان و جێگای ئاگردان و چرا داگیرساندنە جێگای گڕو بلێسە پرتـەوەی نـورو بەرەکەی شێخ شمس الدینە یەکێکیان بۆتە جێگای پاشماوەی خۆراك کە مەزبەلەیـە ئـەوی دیکەیان جێگای پیاوانی زاناو دانایان کە چرای تێدا هەڵگیرساوە.
(٤) ئەجزا: شتێك لەچەند بەشێك پێك هاتبێ، عناسیر: کۆی عنسر-رەگەز، مایل: ئارەزوو.
تۆ ورد بەرەوەو تێبفکرە کە ئەو دنیایەی کە دەیبینی لەچەند شـت پێـك هـاتووە هـەروەکو سروشـت کەچـەند رەگـەزە جـا ئەوانـەی هەنـدێکیان ئارەزوویـان بـەلای خـوداوە هەیـە و هەندێکی دیکەیان بەدوای ئارەزووی هەواو نەفسی خۆیانن.

**قەترەی ئەسەری سونبول و یەك چقڵ و گیایە[١].**

**نوقسان لە تەرەف قابلە نەك فاعلی موختار**

**ئەم قەولی منە رەئی جەمعی حوکەمایە[٢].**

**بورهانە لەسەر جەهلی عەدو شەمسی حەقیقەت**

**تالع بووە ئەو ئەحمەقە جویای چرایە[٣].**

**چاوی بەتەمەع پڕ بووە، تەلبی بە حەسادەت**

---

(١) تەرەف: لەلایەن، مەبدەو: بنەما، فەییاز: ئاودار پڕ ئاو بەرەکەت.
کاتێك بارانی رەحمەت دەبارێت لەلایەن خواوە هەر قەترەیەکی ئەو ئاوە دەبێتە هۆی رواندنی گوڵی سونبول بە دڵۆپێکی دیکەی دەبێتە هۆی شین بوونی درك و گیا واتە رەحمەتی و بەرەکەی خوا لەدنیادا بۆکەسانی باش و خراپە کەسانی باش گوڵی سونبول کەسی خراپ چقڵ و گیا.

(٢) نوقسان: کەمی، لەتەرەف: لەلایەن، فاعلی موختار: مەبەست خوایە، قول: قسە، جەمیع: سەرجەم، حوکمایە: کۆی (حکیم)ە زانا.
کەموکوڕی لەلای بەرامبەرەوەیە کە ناتوانێت کاروبارەکانی بەتەواوی جێبەجێ بکات نەك لەلایەن خالقی کاربەجێ، دیارە ئەو قسەیەی کەمن دەیکەم قسەی سەرجەم زانایانە کە ئەوانیش هەروا دەڵێن.

(٣) بورهان: سەلماندن–شێخ بورهان شێخ شمس الدین، جەهل: نەفام، عەدو: دوژمن، شمس: رۆژ–کورتکراوەی شێخ بورهان شمس الدین پیری شاعیر، حقیقت: راستی، تالع: بەدیارکەوتن، ئەحمەق: نەزان–گێل، جویا: گەڕان بەدوای شت.
هەڵاتنی رۆژ بەڵگەی بەهێزەو پێویستی بە سەلماندن ناکات کە دوژمن نەفامە چونکە ئەو نەفامە وەها دەرکەوتووە کە بەدوای چرادا دەگەڕێت، یاخود شێخ بورهانە وەکو رۆژی رووناکی راستی وایە بۆ دوژمنی نەفام هەتا بێت و بەختی یاوەر بێت ئیتر چ پێویست دەکات بەدوای چرادا بگەڕێت چونکە شێخ بورهان رۆژی رووناکەو لەچرا بەشەوق ترە.

وەک بـــــەهائیم، رەحـــــەتی هـــــەر لەشـــــەودایە[1].
هینـــــدو نیـــــە ئـــــاایینی لەئاوێنـــــە تەعنـــــدا
ئاوێنـــە چـــە سووچـــی هەیـــە ئـــەو رووی ســـیایە[2].
پەروانـــەی هـــەر جـــەمعی نـــەبێ چـــاکە (حـــەریقی)
خـــۆت بنێـــرە نێـــو زومرەیـــی ئـــەم شەمســـی هودایـــە[3].

---

(١) قەلب: دڵ، بەهائیم: کۆی بهیم- ئاژەڵی چوارپێ، رەحـەت: پشـوودان پەیوەنـدی بـەدێری پێش خۆیەوە هەیە واتە کەسی نەفام هێندە چاوی بەتەماعەئەو پڕنابێتەوە، دڵیش پڕ لـە حەسادەت بۆیە وەکو ئاژەڵە کەبەڕۆژ هەر باری لـێ بـار دەکرێـت بۆیـە شـەو پشـوو دەدات ئەویش هەر بەشەو پشوو دەدات.

(٢) هیندو: هیندوسـتان بـۆ زوڵفـی رەشـیش بـەکاردێت، تـەعن: بەدیارخسـتنی عـەیبی خـەڵك، سووچ: گوناه-سیا=رەش.
ئاایینی ئەو هیندوسی نییە هەتا بێت ئاوێنە تاوانبار بکات عەیبی ئاوێنە بەدیاربخات چـونکە ئاوێنە هیچ گوناهی نییە ئەو خۆی زوڵفی هاتۆتە سەر رووی و رووخساری رەش بووە.

(٣) پەروانە: پەپوولە، جەمع: شـتی پـەرت و بـڵاو کۆبکرێتـەوە، زومـرە: دەسـتە، هودایـە: رێ پێشاندەر.
وا باش و چاکە حەریق هەروەکو پەپوولە چۆن بـەدەوری چـرا کۆدەبنـەوە تـۆش وەرە نـاو ئەو دەستەی شێخ (شمس الدین)ە، چونکە ئەوە رێگا پێشاندەر.

خـــەیاڵت مونحەســـیر بـــوو ئـــەی دڵـــە غافـــل لـــە دنیایـــە
نەدامـــەت بـــوو نەتیجـــەی ئـــاخری ئـــەم شـــورو غەوغایـــە[1].
ئـــەوا لازم بـــوو سەرخۆشـــی لـــەتۆ ئـــەی دڵ کـــە سەربۆشـــی
بـــەبادەی غـــافلی بـــێ هۆشـــی دەردت قـــەت شـــیفای نایـــە[2].
عەجـــەب بـــۆت بۆتـــە زســـتان زەمهـــەریری بـــاری عوســـیانت
کەشک نابەی چـــە ســـەرمایە ئـــەڵێ وەی وەی چـــە ســـەرمایە[3].
بەدەســـتی دێـــوی نەفســـم دڵ وەکـــو مـــورغی بـــێ پـــەڕ وایـــە
وەکو پەروانەی بـــۆ شـــەمعی تەلـــەسمی ئـــەو بـــێ پـــەڕ وایـــە[4].

---

(١) مونحەسیر: راوەستان لەسەر شتێك لە چوارچێوەیەکی دیاری کراو، نەدامـەت: پەشـیمانی، نەتیجە: ئەنجام، شورو غەوغا: ئاژاوە.
خەیاڵت لەچوارچێوەیەکی تەسکدا ئابلووقەدار بوو ئەی دڵـە تـۆش غافـل و بـێ ئاگـا بـووی هەموو خەیاڵت بەدنیاوە بـوو نـابێ ئاگـابوو لەشـتی دیکـە ئـەوەش بـووە هـۆی ئـەوەی کـە پەشیمان ببیەوە چونکە ئەنجامی ئەو ئاژاوەو پەشێویە هەر پەشیمانییە.
(٢) لازم: پێویست، بادە: مەی.
ئەوە پێویست بوو کەتۆ سەرخۆش بی و ئاگات لەخۆت نەمێنێ هەر ئـەوەش وای کـرد دڵـت پەردەیەکی بەسەردا بێت سەرتاپای دڵت دابگرێت ئەو سەرخۆشی و غافـل بوونـەت بـەهۆی (مەی)یەوە بووە کەبێ هۆشی کردی دیارە بەمەی غافلی و بـێ هۆشـی ئـەو دەردەی هەتـە شیفای نایەو چاك نابێتەوە.
(٣) عەجەب: سەیرە، زەمهەریر: سەرمای زۆر سـەخت، عوسـیان: یـاخی بـوون–هەڵگەڕانـەوە، سەرمایە: موڵك و ماڵ.
جێگـای سەرسـوڕمانە کـە ئـەو زسـتانە سـاردو دژوارە بۆتـە هـۆی ئـەوەی یـاخی بـبی هەڵبگەڕێیتەوە لەکاتێکدا هیچ شتێك شك نابەوی لەماڵ و موڵکل دنیاو دەڵێی هەی هـاوار چ سەرمایە ! لەنێوان سەرمایەو سەرمایە جناس پێك چوو هەیە.
(٤) مورغ: باڵندە، بێ پەڕ: بێ باڵ، پەروانە: پەپوولـە، شـەمع: مـۆم، تەسـلیم: ئـەو کاغـەزەی فاڵچییەکان بەکاری دەهێنن بۆ دوعا کردن.
من گیرۆدەی ئەو نەفسە بەدخوەی خۆمم هەردەڵێی دێوەو دەسەڵاتم بەسەریدا نییە دڵـیش هەروەکو باڵندەیەی بێ پـەڕ وایـەو ناتوانێـت بفڕێـت پەپوولـەش بـۆ چرا وەکـو تەلسـمێکە

کە طفلی عیشقی بێ مەشقم لەنێو بازاڕی سەودایە
بەئەو سەودایە سەرخۆشە ئەڵێ کارم لەسەودایە[1].

هەتا شەیتان مودبر بێ مۆدب بێ نەفسی زاڵم بێ
عەجەب کەوتوتە دەست زاڵم ئومورت عەینی زوڵمایە[2].

خوا رەبی نەجاتم دەی لەدەست ئەو دێوی بێ رەحمە
کەوا وەک دوژمنی خوێنین بەدایم لێم بەداوایە[3].

خەیاڵاتت هەموو بەشمە وەکو ریس و گوریس وایە
هەرچی دەکەی دەڵێن هەیەی فلانی چەندە ریسوایە[4].

---

گەلێك عەودالیەتی بۆی بێ سەودایە.

(١) طفل: منداڵ، سەودا: ئالوێر–هەواو هەوەس.

لەنێو بازاڕی هەواو هەوەسدا وەکو منداڵێك وام کە بچێتە نێو بازاڕی عەشق و هیچ شتێك لەو عەشقە نەزانێت و مەشق و راهێنانی نەکردبێ، جا ئەو جۆرە عەشقە بێ سوودەو وەکو کەسێکی سەرخۆش دێتە مەیدان کە ئاگاداری عەشق نەبێت و هەر دەڵێی کاری من لەو ئالووێریە دایە.

(٢) مودبر: نەخشەدانەر، مۆدب: بەڕەوشت، ئومور: ئیش و کار.

هەتا شەیتان نەخشە دارێژەربێت و کەسی بەڕەوشتیش نەفسەکەی زاڵم بێت هەوڵی ئەمەی لەگەڵ بدات و بۆئەوەی کاری خراپ ئەنجام بدات ئەوە جێگای سەرسوڕمانە کەتۆ کەوتوویەتیە دەست کەسێکی زۆردارو هەتا واش بێت ئیش و کارەکانت هەر گومڕایی و رەشایی و زوڵمانییە.

(٣) خوایە دەپاڕێمەوە لێت کە رزگارم بکەی لەدەستی ئەو دێوە کە نەفسی بەدکارە هەردەڵێی کەسێکم لێی کوشتووە بەدوای خوێنی خۆیدا دەگەڕێت هەمووکات بەدوامەوەیەو داوای خوێنی خۆی دەکات.

(٤) پەشم: خوری، ریس و گوریس: خوری کاتێك دەڕێسرێ دەبێتە داوێکی ئەستوور گوریسی لێ درووست دەکرێت، ریسوا: شەرمەزار.

خەیاڵات و بیرکردنەوەت هەروەکو خوری وایە کاتێك دەڕێسرێ، ریس و گوریسی لێ درووست دەکرێت جا هەر شتێك دەکەی کەس لێت رازی نییە و دەڵێن سەیرکە فلانەکەس

کەخالی بێ دڵی عاشق لەبارەی حوبی مەعشوقی
بەخۆرایت نەوێ چاکە وەکو شوشەی شکاو وایە[١].
مەبە تالب بەزولفینی بەمیثلی شکلی لاوایە
ئەگەر لەولایە خوێت لادەی لەلام تحقیقە ئەولایە[٢].
لەقاپی ئاستانەی مورشیدی ئەرشەد عەلی عالی
لەوێ رۆحت فیداکە کەتۆ نەجاتت هەر لەوێ دایە[٣].
وەکو پەروانە بۆ شەمعی جەمالی ئەو کە موشتاقم
بەتەصویری (حەریقی) هێندە سۆزی ئەو لەدڵدایە[٤].

---

چەندە شەرمەزارە.

(١) خالی: بۆش-چۆل، بادە:مەی، حوب: خۆشەویست، مەعشوق: دلبەرەکەی.
گەرهاتوو دڵی عاشق چۆڵ و هۆڵ بوو لەبادەی خۆشەویستی دڵدارەکەی ئەوکاتە هەروا لەهیچ و خۆڕایی شوشەی شکاوت نەوێ چونکە ئەوها چاکە.

(٢) تالب: داوا، شکل: وێنە، تحقیق: مسۆگەر.
تۆ داوای زولفەکانی مەکە چونکە هەروەکو لا وایە جا ئەگەر هاتوو زولفی ئەو لاییەی لادا دیارنەبو بەمسۆگەری لەلایەکەی دیکە دایە.

(٣) قاپی: دەرگا، مورشید: رێ پێشاندەر، ئەرشەد: ئازاتر لە هاوڕێکانی.
لەبەر دەرگای گەورەو رێ پێشاندەری کەسێکی ئازاو گەورەی وەکو عەلی دام و جا تۆش روحت لەو رێگایە فیداکە چونکە رێگای رزگاری لەوێوەیە.

(٤) پەروانە: پەپوولە، شەمع: مۆم، موشتاق: پەرۆش، تەسویر: وێنە.
هەروەکو چۆن پەروانە عەشقی چراو مۆمە هەر بەدەوریدا دەسووڕێتەوە هەتا باڵەکانی لەئاگرە کە دەدات و لەعەشقی ئاگرەکە دەسووتێ منیش عاشق و پەرۆشی جوانی ئەوم و ئەویش بەوێنەی حەریقی سۆزو خۆشەویستی لە دڵدایە.

ســەری هــەر مــوو زبــانی شــوکرە دەســتی تەمەنایــە
دوعــای پێویســتە بــۆ حــەبل ئــەلمتین عــومری ئاغایــە[١].
بەعــەقلی موشــگاف و تــەبعی حیکمــەت بــاقی هــەر ئەوصــاف
دوتــای رشــتەی فنــا بــوو حوســنی نــەزم و دوری یەکتایــە[٢].
بــەڵێ هــەموو پەیوەنــدو بەســتەو ئولفــەتی کلــە
قــوای ئەعچــای بەســەرداری رەئیســی کــول ئەجزایــە[٣].
دوعــاگۆ و چــاکەرو فــەراش و نــازر جوملــە مــەنزورە
لەســەر خــوانی عــەتای ئیحســان و بــەزلی ئــەو موهیایــە[٤].

---

(١) سەری هەموو کاتێك بەقەدەرایی موویەك بەرز ناکەوەو زمانیشی هەردەم شوکر دەکات و دەستیشی هەردەم بەرزکردۆتەوە لەبەر خوا دەپارێتەوە چونکە لای وایە ئەوشتانەی پێی دراوە پێویست بەدوعا دەکات بۆئەوەی ئەو پەیوەندییە بەهێزەی لەگەڵدا نەبرێت بەوەش ژیانی پڕ تەمەنی بەخۆشی و شادی دەژیت هەروەکو ژیانی ئاغایان.

(٢) موشگاف: بیرتیژ، حیکمەت: دانایی، باف: ئاوێنە، ئەوصاف: سیفات، دوتا: دوو تال دوولا، رشتە: رستە، فەنابوو: لەناوچوو، دوورییە یەکتا: مرواری بێ هاوتا.
بەعەقڵی و بیرتیژی و خاوەنی ئەو داناییەی کەهەیەتی هەردەڵێی ئاوێنەیەو هەموو سیفەتەکانی رەنگی داوەتەوە بەدوو مووی ئەولاو ئەولای هەرچی هەبوو لەدوری بێ هاوتاو جوانی هۆنینەوەی هەموو لەناوچوو.

(٣) ئولفەت: خوو پێوەگرتن، کول: گشت، ئەجزاو: کۆی جزو بەش.
بەڵێ هەموو پەیوەند پێکەوە بەستان خوویان بەیەکەوە گرتووە کەئەویش کۆتایی هەموو شتێك گلەو بۆ گڵ دەگەڕێتەوە هەرچی هێزی دڵیش هەیە ئەوە سەرداری هەموو ئەندامەکانی دیکەیە.

(٤) جوملە: گشت، مەترور: ئەوەی دەبینرێ، عەتا: بەخشندە، ئیحسان: چاکە، موهیا: ئامادە.
هەرچی کەسانی دەست بە دوعاو چاکەکارو خێرخواز هەرهەموویان بەگشتی دیارن و لەبەر چاون و ئامادە لەسەر سفرەو خوانی چونکە ئەو کەسێکی بەخشندەو چاك و نان دەرە بۆیە هەمووشت ئامادە کراوە.

سەر ئامەد بۆ ئەدەب وەك عەقل و جودە سەر مەخفی بوو
تومەز ئیسمی لەگەڵ هەرسیٚ موافق یەك مسمایە[١].
بەپەنجە تۆبەتی سەردار ئەگەر بەحری کەرەم دەرهات
ئەڵیٚ دەریاو جۆش هات و کەفی کرد لەو مەعمایە[٢].
لەپاش مەوج و تەلاتوم تیکی سەرفی حسابم وت
تەماشای کرد لەگەڵ میللەت وەکو بەحری کەرەم وایە[٣].
بەنۆش عەدلی تەلعەت یوسفی میسری عەزیزانە
بەپێش قەهری سەیف الدین و سەیف الله ئەعدایە[٤].

---

(١) ئاماد: هامۆشۆکەر، مەخفی: بەنهێنی، مسما: ناو.
هاموشۆکەرانی پیاو چاکان و کۆڕو دیوەخانی ئەدەب هەروەکو کەسێکی عاقڵ و خاوەن جود هەربەنهێنی ئەنجام دەدرێت چونکە ناوی ئەوان لەگەڵ هەرسێکان یەك ناوە یاخود هەرسێکان لیٚ پێك دێت.

(٢) بەحر: دەریا، کەرەم: چاوتێر، بەحری کەرەم: دەڵێی دەریایە لەچاو تێری نان بدەیی.
بەپەنجەکانی گەر بیەوێت سەرداری و گەورەیی بنوێنیٚ ئاسانە چونکە ئەو خاوەنی دەریایەك کەرەمە لەچاوتێری و نان بدەیی هەروەکو ئەوەی دەریا جۆش بدات و لەگەڵ ئەو جۆش و خرۆشییەی دەریا کەفی لیٚ هەستێت، دەبێت ئەو بەیتە ئامارە بێت بەئەو موعجیزەی پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك ئاو لەنێو پەنجەکانی هاتووە.

(٣) مەوج: شەپۆل، تەلاتوم: دەنگەدەنگ هاژەهاژی ئاو.
لەپاش ئەوەی دەریا شەپۆلی کردو هاژەی لێوەهات منیش حسابی خۆم کردو تەماشام کرد لەگەڵ دەوروپشتم ئەو هەروەکو دەریایەکی بەخشندە وایە.

(٤) عەدل: داد، تەلعەت، دەرکەوتن، ئەعدا: دوژمن.
لەژێر سایەو سێبەری دادپەروەری دەرکەوتنی یوسفی میسر (سەلامی خوای لیٚ بێت) ئەو شوێنە بۆتە جێگای عەزیزان ئەوەش پێش ئەوەی تورەیی و سیف الدین و سیف الله دوژمنییان بێت.

هــەزار رەحمـــەت لـــەروحی پـــاکی ئـــەو ئابـــائو ئەجـــدادە
کـــە ئـــەولادی وەکـــو ئەجـــدادی عـــەدل و همزایـــە[1].

دوعام کرد سلسلەی ئەم ئەصل و فەرعـە هــەر موسلسـل بـی
جـەوابم بیــت دوعــای زنجــیری عــەدلت حــوکمی ممضایە[2].

لەبـــەر شـــیرینی پەیوەنـــد نییـــە تـــا عـــەزیزان
لـــەلامم فایقـــە وەك ئیشـــکەر شـــەهدو مونایـــە[3].

ئەگەرچـــی ئەمتعـــەی فکـــرم لەبەرچـــاوە بـــەئاوا چـــوو
دلم غـــەواس جـــەزبی گەوهـــەری دەریـــای مەعنایـــە[4].

---

(١) ئابائو ئەجدادە: بابو باپیران، ئەولاد: منداڵ، ممضایە: ئیمزاکراوە.
هەزار رەحمەت لـەگیانی پـاکی بـاب و بـاپیرانی بێـت هـەروەها منداڵەکانیشـی وەکـو خـۆی باپیرانی پەروەردە کردووە کەلە دادپەروەریدا هەر رای یەکترن.

(٢) سلسلە: زنجیرە مەبەست نەوە دوای نەوە، موسلسل: بەردەوام بێت.
هەردەم دەستم بەرز کردۆتەوەو روو لەخوا دەکەم و دەپاڕێمەوە ئەصل و نەسەبی هەر بەو شێوەیە بێـت و بـەردەوام بێـت بۆئـەوەی داد پـەروەریت بـەردەوام بێـت و بـەئیمزا کـراوی بمێنێتەوەو دوعام گیرابێت.

(٣) شەهد: هەنگوین، فائق: دەگمەنە چاك.
لەبەر شیرینی ئەو پەیوەندییەی کـە هەیـە لـەنێوان عەزیزانـدا، قسـەو گفـتم گـەلێك چـاك و شیرینە هەروەکو هەنگوینی پاڵفتە کراوە وایە.

(٤) ئەمتعــە: کەلوپــەل، غــەواص: ئامێرێکــە لــەژێرئاودا دەڕوا، جــەزب: راکێشــان، گەوهــەر: مادەیەکی بەنرخە.
ئەگەرچـی کەلوپـەلـەکانی کەلـە مێشـکمدایە دێـت و دەچـێت لەبەرچـاوم هـەموو رۆیشـت و بەئاودا چوو بەڵام دڵم وەکـو غەواسـە ئەوهـەموو شـتانە بـۆلای خـۆی رادەکێشـێت چـونکە بیروفکرم هەروەکو گەوهـەرە کەلـەناو دەریـا دایـەیاخود گفتـەکانم پـڕ بـە گەوهـەری دەریـا مانای هەیە.

# پیتی یێ

لەگەڵ مانگی موبارەك بێ قەزابێ سازشم نابێ

لەتەکلیفی ئەدای بێ موهلەتی گونجایشم نابێ[١].

حەکیمانە قەراری چا نەفەرمووی گەر بەشیرینی

ئەوەندە دەم تاڵە قەت رۆژ ئەمن ئاسایشم نابێ[٢].

بێ قەزابی رەمەزان هیندە بەتەکلیفە ئەدای

سورو ساتێکی ئەوی خالییە تاقەتی بەوەفابێ[٣].

گەر بەحەکیمانە بەشیرینی نەفەرمووی چابێ

هێندە دەم تاڵە بەروو ترشی لەخەوف و رەجایە[٤].

باسی دەرویشی ئەکەم دەعوەتی بروشی ئەکەم

ئەو لەرەسما نیەتی هەیئەتی تەشریف و لیقای[٥].

---

(١) لەگەڵ هاتنی مانگی موبارەك کە مانگی رەمەزانە بێ وەی بی سازیشم نابێ بەهیچ جۆرێك لەداواکردنی و جێبەجێکردنی مولەتی ناوی گونجانیش نابێت.

(٢) وەکو کەسێکی حەکیم بڕیاری چا نەدەی گەر بەشیرینی نەبێت دەکرێت بڕیاری چاك بدەی بەشیرینی یاخود هەرکاتێك چا هەبوو دەبێت شیرین بێت هێندە دەم تاڵە هەرگیز بەرۆژ ئارام و ئاسایشم نابێ

(٣) بێ وەی بی رەمەزان هێندە بەزەحمەتی بۆ جێبەجێکردن هیچ ساتێك ئەوەی دەستی خالیەو بۆشە دەبێت وەفای هەبێت بۆ جێبەجێکردنی.

(٤) گەر بەدانایی و حەکیمی بەشیرینی نەڵێی چانابێ یاخود چا بێ شیرینی نابێت دەمیش هێندە تاڵە بەتوڕەیی و رووترشیە لەترس و پاڕانەوەدایە.

(٥) بروش: گەنم دەهاڕێ دەێتە بروش کفتەی لێ درووست دەکرێت، هەیئە: شێوە، لیقا: بەیەکگەیشتن.

بــەر وەلا عــەرزی بکــا بۆچــی وەکــو ســنفی مــەلای
تــۆ کــە خــۆت مەمســەکی و واعــزی ئیحســان و عــەتای[1].
ئیختساســـی نییـــە بـــۆ ئـــەهلی تـــنعم بـــیٚ زەوال
هەرکەســی موســلیمی مومتــازە بەتەشــریفی لیقــای[2].

---

باسی دەروێشێك دەکەم و دەعوەتی دەکەم بروشی ئـەدەمیٚ بـەڵام ئـەو لەوێنـەدا شـێوەی نییە هەتا تەشریفی پێی بگا.

(١)عەتا: بەخشندە، ئیحسان: چاکە، واعز: ئەوەی ئامۆژگاری خەڵك دەکا.

پێش ئەوەی مەلا عەرزی بکا کە بۆچی لەرێزو هاوشانی مەلادایت تـۆ کـەخۆت پێوەگرتـووە ئامۆژگاری چاك و بەخشندەی.

(٢) ئیختساسی: پسپۆری،، تنعم: نعمەت پێدراو، زەوال: ئاوابوون.

پسپۆری نییە بۆ کەسانێك کە نعمەتی لەگەڵدا کرابێت ئەو نعمەت ئاوا نابێت و لەناو ناچێت هەرکەسێك موسڵمانێکی باشە خۆشی لە بەگەیشتنی تەشریفی.

بــــێ جێیــــە قســــەکردنی بــــێ ڕێ و بــــەبێ جــــێ

بــــێ یاریــــەی یــــارم ئــــەمن نایەمــــە ســــەر ڕێ[١].

وەک شــــەمعی ســــەحەر چــــاوەڕوانی نەفەســــێکم

کــەی بــێ لەتــەرەف غونچــە دەمــێکم کــە دەمــێ بــێ[٢].

مــــەحرومی حــــوزوری مــــەدنی و خــــاکی مەدینــــەم

بــەم حالــەوە قــەت رووم نییــە بــەینی مــەدەنی بــێ[٣].

پــــەیکانی مــــوژەت بــــو ســــوپەری ســــینە ڕەوانکــــە

نامــــەرد ئــــەوەبێ کــــە لەبــــەر ئــــەوتیرە ببــــزوێ[٤].

---

(١) بێ جێیە: بێ مەعنایە، قسەکردنی بێ ڕێ و جێ: قسەی بێ سەروبەر.
قسەکردنی بێ ڕێ و جێ گەلێك بێ مەعنایە گەر لەکات و شوێنی خۆی نەبێت، منیش بەبێ پرس و ڕای خۆشەویستەکەم نایەمە سەر ڕێگای ڕاست.

(٢) شەمع: چرا، سەحەر: بەرەبەری بەیانی، لەتەرەف: لەلایەن، دەمێك: دەم، دەمێ: ساتێ.
هەروەکو چرا بەرەبەیانی کە هەڵدێ و دنیا ڕووناك دەکاتەوە لەچرکە ساتێکدا منیش بەنیازی چاوەڕوای یەك نەفەسم کەلەلای ئەوەوە بێت هەروەکو چۆن غونچە تازە دەمی دەکاتەوە بەدەم ژیانەوە منیش چاوەڕوای ئەوەم ساتێ.

(٣) مەحروم: بێ بەش، حوزور: ئامادەبوو.
من بێ بەش بووم لەو سەردەمەی ئەو تێدا دەژیا و ئێستاش هەر بێبەشم لەخاکی پیرۆزی مەدینە کە گۆڕی تۆی تێدایە، جا بەوە شێوەیە چۆن ڕووم هەیە بێمە حوزورت کەخاکی مەدینەیە.

(٤) پەیکان: سەرەتیر، مووژە: برژانگ، سوپەر: ئامرازێکی جەنگی بوو جاران جەنگاوەران بەکاریان دەهێنا بۆ خۆپاراستن لەتیری دوژمنان.
سەرەتیری برژانگەکان ڕەوان بکە بۆ سەر سوپەری من نامەردم ئەگەر لەبەر ئەوتیرە ڕابکەم کەتۆ بۆمن دەهاوێی واتە ئەو خۆشەویستەو بزەی سەر لێوت کە بۆمن ڕەوان دەکەن نامەردم ئەگەر لەبەر ئەو خۆشەویستییەت هەڵبێم.

موحتـــاجی بەمـــەودای دەمـــی تیغـــی بـــرۆت دڵ
بـــینێ لـــەملم شـــەرت کـــە ئـــایم نـــەبێ ئیســـتێ[1].
ئـــەغیارو رەقیـــب شـــادو ئـــەمن هەمـــدەمی فریـــاد
یـــارەب خواکـــەی بـــێ کـــەوەختی هـــەلی مـــن بـــێ[2].
زۆرم وت ئـــەی دڵ مەبـــە ســـەرکەس لـــەحوزوری
زۆر موســـتەحەقی خـــوێری دەبـــا وات بەســـەربێ[3].
تـــوبی و ســـەری خـــۆت عەبـــدێکی زۆر چـــاکە (حـــەریقی)
ئـــازادی مەکـــە ئـــاخری بۆتـــۆ بەعەمـــەل دێ[4].

---

(١) موحتاج: پێویست، مەودا: دەمی چەقۆ، ئایم: ئاه.
تیغی برۆکانت هێندە تیژە وەکو دەمی چەقۆ دڵ پێویستییەتی، جا ئەو تیغە تیژە بهێنە بە ملماو شەرتیش بێت من ئاهێك نەکەم بەهیچ جۆرێك بەمل شەرت بێت ئاهو ناڵە نەکەم و نەڵێم ئۆف.
(٢) ئەغیار: بێگانە، رەقیب: دوژمن، هەمدەم: هاودەم هاونشین، هەل: تۆبەت.
ئێستا بێگانە و دوژمن هەرهەموویان شادو بەدڵ خۆشی بەتەنها من هاودەم و هاونشینم نییەو بەتەنهام، دەی خوایە دەبێت کەی بێت هەلێك بۆمن هەڵکەوێ تۆرەی من بێت.
(٣) سەرکەش: لارێ، موستەحەقی: شایانی ئەوەی، بەڵا: موسیبەت ناخۆشی.
زۆر بەدڵم گوت بەسە واز بهێنە هێندە لەلارێ دەرمەچوو لەرێگای ئەو لامەدە بەگوێت نەکردم جا کەواتە خوێری شایانی ئەو بەڵایەت بەسەربێ.
(٤)سوێند بەسەری خۆت (حەریق) عەبدێکی زۆرچاکە عەیبی نییە، تۆش دەستی خۆتی لێ مەکەوە چونکە دوواجار هەر کەڵکێکی دەبێ بۆت.

قەمـــەر کەوتـــە میزانـــی خـــەیالم موشـــتەری بـــابێ

لەعەقـــدی نـــەزم و نەســـرم تـــالبی عەقـــدی ســـریابێ (١).

جـــەمالی دولبـــەری فکـــرم لەخەلوەتایـــە تائێســـتا

بـــلا بـــا دولبـــەر ئاســـابێ قـــەبوولی ئـــەهلی ئـــارابێ (٢).

لـــەدوکانی خـــەیالم بـــۆ عـــروس دڵ غـــەزەل دێـــنم

گرانجـــانی بـــەکار نایـــەت کـــەس ســـەوادی لەســـەردابێ (٣).

لـــەموژدەی نەوبـــەهاری غەلغەلـــەی بولبـــول لـــەدەوری گـــوڵ

وەکو قـومری دەبـێ تـەوقی وەفـای سـەردەم لـەمل دابـێ (٤).

---

(١) قەمەر: مانگ، میزان: تەرازوو بروجی حەوتەی ئاسمان، موشـتری: کرپـار نـاوی یەکێکـە لـە گەورەترین هەسارەکانی خۆر، عەقد= ملوانکە

مانگ کەوتە نێو بروجی حەوتەمی ئاسمان خەیاڵم پێوەی گیرۆدە بوو دەبا کرپاربێت یاخود دولبەرم هێندە جوانە کەوتۆتە نێو ئەستێرەی حەوتەوانەی خەیاڵم ئینجا نۆرەی هەسـارەی موشـتەریە بابێـت چـونکە هۆنینـەوەی هـۆنراوەو پەخشـانم هێنـدە درەوشـاوەن هـەروەکو ئەستێرە گەشەکانی ئاسمان کەیەکیان گرتووەو شێوەی ملوانکەیان پێك هێناوە.

(٢) خەلوەت: گۆشەنشینی، بالا: بەژن، ئارایی: جوان و گەشاوە.

بیرو هۆشم هەر دەڵێی دولبەرەکەمە و هێنـدە جوانـە وا هـەتا ئێسـتا هـەر لـە گۆشەنشـینی دایە جوانی و بەژن و باڵای رازاوە لەلای خاوەن جوانان پەسندە.

(٣) گرانجان: گران فرۆش، سەودا: ئالوێر، عروس: بوك.

لەبیرو هۆشی خەیاڵمدا لەبۆ بوکێ دڵ ئەوەی دڵ دەیەوێ حەزی لێ دەکات غەزەل دەهێنم گران فرۆشی بەکەڵك نایەت هەرکەسێك سەوداو ئالوێری لەبیرو مێشکدا هەبێت.

(٤) غەلغەلە بولبول: ئاوازی بولبول، قومری: کوکوختی، تەوق: کۆت و بەند.

موژدە بێت وا بەهار هات بە بەڵگەی ئەوە گوڵ پشکوتو غونچە دەمیان کرایەوەو بولبولیش لەسەر ئەو گوڵانە دەخوێنن بەڵام قومری ئاسا هـەر دەبێـت کـوت و بەنـدی وەفایـان لـەمل دابێت.

نەفەس دەم دیدە پڕ ئاب و سەماوەری سینە جەرگ ئاتەش

کەلامم قەندە گەر ساتی لەگەڵ من ئارەزووی چابی[١].

سەرم سەمتوورو سینەم سازو ئەشکم تارە بەو شەرتە

بدا ساقی مەیی نابێ بڵێ موتریب بڵێی نابی[٢].

لەدامێنی خەیالمدا منی گول بچنە ئەی شاهید

بەشەرتێ شاهی شمس الدین لەدڵما جلوە ئارابی[٣].

لە کەرەمی لوتفی مەولاوە نییە ساردی لەمەولاوە

بەسەرما رویدە سەرما نیە باکم بە سەرمابی[٤].

---

(١) دیدە: چاو، ئاتەش: ئاگر، قەند: شەکر، چا: باش-شلەیەکە دەخورێتەوە.
هەناسەی دەمم ئاوی چاو گەلێك تەڕو ئاودارن سینەشم هەروەکو سەماوەرە جەرگیشم ئاگر ئاسا قسەو گوفتارم وەکو قەندی شەکر شیرینە جا ئەگەر ساقی ئارەزووی لەگەڵمدا چاك بێت یاخود فرمێسکی چاوم لەناو سەماوەری سینەم دەکرێ بەئاگری جەرگیشم دێتە کوڵ و قسەم گوفتاریشم وەکو شەکر وایە ئەگەر ساقی ئارەزووی لەچا خواردنەوە بێت.

(٢) سەمتوورو ساز: دوو ئامێری مۆسیقانە، موتریب: گۆرانی بێژ.
سەرم وەکو سەمتوورو سینەشم ساز ئاسا فرمێسکم بێ! مۆسیقایە و بەو مەرجەی ساقی پیاڵەیەك مەیم بداتێ گۆرانی بێژیش نابێت بڵێ نا تەنها مەی بۆمنە.

(٣) جلوە: درەوشانەوە نووری خوا لەدڵی خواناسان.
وەرە ئەی شاهید لە بیرو خەیاڵی مندا گوڵ بچنە چونکە خەیاڵی من وەکو باخچە وایەو پڕە لەگوڵ، بەڵام بەو مەرجەی نووری شێخ و پیری شمس الدین بێتە دڵم و بدرەوشێتەوە.

(٤) کەرەم: بەرەکەت، مەولا: گەورە، لەمەولاوە: لەوە بەدواوە.
لەسایەی کەرەم و بەرەکەت و لوتفی گەورەم شمس الدین هیچ ساردیە نایەت لەوە بەدواوە، چونکە سەرما بەسەرمدا تێپەڕیوە بۆیە هیچ باکم نییە هەرچیم بەسەر دێت، لەنێوان مەولاوە و لەمەولاوە جناس وێ چوو هەیە.

**خەلاتی شاە نەورۆزی نیشانەی اتش ئەفروزی**
**نەسیم هێنی بەدڵسۆزی دڵێی سوزی جەفا نابیٚ[1] .**
**رەئیسی هەورو توپچی رەعدو تۆپ و بەرق و نیزام باران**
**نەسیم پێش رەو تەلیعە تەرزە فەراش دەبیٚ بابیٚ[2] .**
**شەماڵ سەرتیپ تەرتبی خولامانەی غولامانە**
**جنوبی یاوەری فەوجی شەدەو دەسماڵی والآبیٚ[3] .**
**بەڵەك بو كێو و سەحرا وەك دەڵەك خۆی دزیەوە زستان**
**زەیستان ئیتفاقە چۆن بەری خست هێزی پێی نابیٚ[4] .**

---

(١) ئاتەش ئەفرۆز: ئاگر هەڵگیرسێن، نەسیم: شنە.
پاداشت وخەلاتی شاە بۆ نەورۆز کەیەکەم رۆژی ساڵی نوێی کوردیە نیشانەیە بۆ گۆڕانی وەرز بەوەش ئاگر دەکرێتەوە شنەبای هێنانی بە دڵسۆزی ئەو خەلاتەی هێنا کە جەفاو سۆز بەیەکەوە کۆنابنەوە.
(٢) تەلیە: پێشرەو.
هەور هەروەکو تۆپ دەگرمێنێ بروسکەش دەشریقێنێ بۆ نیزامی باران باریت بەلام پێش ئەو باران بارینە شنەبایەك دێت کەپێشرەوی ئەو هەورو بروسکە بارانەیە پاش ئەوە چی دێ بابێ، مەبەست باران بارینە کە دەبێتە هۆی بەرەکەت و پیت و بەرەکەی زەوی.
(٣) بای شەماڵ وەکو سەرتیپ خۆی رێکخست هەروەکو چۆن غولام کەلوپەلی خۆی و گەورەکەی رێك دەخات شەدەو دەسماڵی سەریشی والآ کردووە هەردەڵێی یاوەری بۆخۆی راگرتووە.
(٤) بەڵەك رای کرد بۆ کێو و سەحرا و خۆی دزیەوە لەترسی سەرما هەروەکو دەڵەك ئەوە لەگەڵ زستان رێك کەوتن باری خۆی خست وەکو ئەوەی پێی نەمابێ.

لــەدەنگی رەعــدو رەنگــی بــەرق و نالــەی هــەورو گرمــەی بــا
کەڕو کوێر لەفەرنایــەن مــەر هەناســەی ساردی پــێ مــابێ[1].
لەشەوقی گوڵ لەزەوقی مەل عەجــەب سەرخۆشــە ئــەهلی دڵ
دەبێـــژن تایفـــەی خوبـــان مەگـــەر جەنـــەت بـــەدنیابێ[2].
حەجەر هەروەك شەجەر ناتق بەسـڕری قــودرەتی حــەق بــوو
کەســێ حــاڵی بــبێ حــاڵی دەبــێ گــەر ئــەهلی بینــابێ[3].

---

(١) رەعـد: گرمـەی هـەور، بـەرق: بروسـکە، فـەر: گـەورەیی تیشـکی خواوەنـد لـەدڵی کەسـێك هەڵگیرسێ، مەر: کورتکراوەی مەگەر.
لەگرمە گرم و دەنگی هەورو رەنگی بروسك کە ئـاگری لـێ هەڵدەسـتێ ناڵـەناڵی گڤـەگڤی بـا ئاست ئەوانەدا هەموو کەڕو کوێر نەدەبیستن و نـەدەبینن ئـا ئەوانـە تیشـکی خـوا لـەدڵیان داناگرسێ هەتا نائومێد ببێت لـەرەحمی خـوا (دەبێـت ئامـاژە بێـت بـۆ ئایـەتی ﴿وَلَقَدۡ ذَرَأۡنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِۖ لَهُمۡ قُلُوبٞ لَّا يَفۡقَهُونَ بِهَا وَلَهُمۡ أَعۡيُنٞ لَّا يُبۡصِرُونَ بِهَا وَلَهُمۡ ءَاذَانٞ لَّا يَسۡمَعُونَ بِهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلۡأَنۡعَٰمِ بَلۡ هُمۡ أَضَلُّۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ﴾ (الاعراف: ١٧٩).
(٢) خوبان: جوان، زەوق: ئارەزوو، ئەهلی دڵ: ئەهلی خواناسان.
لەشەوق و جوانی گوڵ لەئارەزووی مـەل کەلەسـەر گوڵان دەخـوێنن جێگـای سەرسـوڕمانە کەئەهلی دڵ کە مەست و سەرخۆشە دەستەو تائیفەی جوانان دەڵـێن دنیـا بەوانـەوە بۆتـە بەهەشت.
(٣) حەجەر: بەرد، شەجەر: دار و درەخت، ناتق: قسەکەر، سڕی: نهێنی، قودرەت: دەسـەڵات، ئەهلی بینا: دووربین.
بەردیش هەروەکو دارو درەخت بەقسەهات ئەوەش لەسڕو قـودرەت و دەسـەڵات حـەق بـوو کە ئەو توانایەی پێ بەخشی بوو جا هەرکەسێك حـاڵی بـێ حـاڵی دەبـێ لەکەسێك ئـەهلی بینابێ.

نیشـــانەی نیعمـــەتی عوقبـــا لـــەدنیادا هووەیـــدا بـــوو
کەســـێ بـــاوەڕ بـــەمن ناکـــا لـــەرەنگی ســـەوزە جویـــابێ[1].

عـــەتای موتلـــەق بەغـــەیری خـــالقی حـــەق بـــوو درەخـــتی رەق
بـــەکێ ئـــەکرێ هـــەموو ســـاتێ شـــکۆفەی ســـەبز پەیـــدابێ[2].

نـــــەباتاتی زەمـــــین نـــــو خێـــــرو جـــــامی لـــــەب ریـــــز
لەخـــەو بێـــدار بـــوو نێـــرگس هـــات بـــەخێربێ مـــالی ئـــاوابێ[3].

بەعـــەزمی دەســـت بوســـی دەســـتە دەســـتە هاتنـــە خدمـــەت
هەموو مەخمور نیسبەت وەك كەسی سەرمەستی صهبا بـێ[4].

---

(١) عوقبا: دوای هەرکاتێك یاداشت وەرگری، هویدا: ئاشکرا.
نیشـانەو بەڵگـەکانی پاداشـتی کردەوەکـان لـەدنیادا ئاشـکرابوو بەدیارکـەوت هـیچ کەسـێك باوەڕ بەمن ناکات ئەو لەمن جودا بۆوە کاتێك رەنگی سەوزبوو.

(٢) عەتا: بەخشندە، موتلەق: رەها، خالقی حەق: خوا، شکۆفە: خونچـە کاتێـك میـوە لـەپێش گەڵا دەپشکوێ، سەبز: سەوز.
لەسایەو بەخشندەی خوای میهرەبان بەشێوەی رەها لەدرەختێکی رەقدا توانی بەری میوە درووست بکمات سەوزبێت ئایا بەئەو نەبێ بەکێ دەکرێت.

(٣) نەبات: روەك، نەوخێز: تازە پێگەیشتوو، جامی لەب ریز: مەبەست لێوی جوانە.
سەرتاپای روەکی سەرزەمین تازە پێگەیشتوو سەریان لەزەوی دەرهێنا هێندە جوانە وەکو دەم و لێوی یار تازەش چاوە مەستی نێرگس ئاسا لەخەو بەخەبـەر هـات دەبـا بـەخێربێ و ماڵی ئاوابێ.

(٤) بوسە: ماچ، مەخمور: مەست، صهباو: پیاڵەی سەڕاب.
بەهەموو دڵەوە و قەناعەتی تەواو خەڵکی دەسـتە دەسـتە دەهاتنـە خزمـەتی و دەسـتییان ماچ دەکرد و هەموویان بەبینینی مەست و سەرخۆش بوون وەکو ئەوکەسەی پیاڵـەی مـەی هەڵقوڕێنی سەرخۆش بێت.

وەنەوشـــە بـــۆ غـــولامی خـــالی خوبـــان گـــەردنی کـــەچ کـــرد
بەوەجهـــە وەجهـــی وەك مـؤمـــن لەبـــەر سـجدە بەسـیمابێ[(١)].
ســـەفینەی فکـــرتم رووچـــوو دەفینـــەی حکمـــتی تـــووش بـــوو
سەلەف حوزی خەلەف هەروەك سەدەف بوو دوڕ مهیـا بـێ[(٢)].
نموونـــەی ئینقیـــادو ســـەرکەش بـــۆ ســـاردی و گـــەرمی
کە مخلس حـالی گـەرم و مـونکرپیش دڵ سـاردە تـا مـابێ[(٣)].
سراج الـدین بـەنووری حـەق بەهـەر شەخسـێ بـەهای دابـێ
بەشەمسـی رووی حسـام الـدین وەفـا کـا بـێ زیبـا نـابێ[(٤)].

---

(١) گوڵە وەنەوشە بۆ غولامەکەی کە هێندە جوان و چاکە گەردەنی کەچ کرد روویەرووش وەك کەسێکی ئیماندار هەردەم نێوچەوانی لەسوجدە دابێ.

(٢) دەفینە شاراوە—گەنجینەی شاراوە، سەفینە: پاپۆر، سەلەف: پێشینەکان، سەدەف: گیانلەبەرێکی ئاویە، حرزی: شوێنی شت لێ پاراست، خەلەف: لەپاش هاتووە.
بیرکردنەوەی من هەروەکو پاپۆر وایە ئێستا بەئاودا روچووە بەڵام گەنجینەی دانایی تووش هات کە پێشینەکان وەکو گەنجینە وانەو بیر لە دەرهێنانی ئەو گیانلەبەر بچووکەو بەنرخە دەکاتەوە لەناو دەریادا.

(٣) ئینقیاد: شت گرتنە ئەستۆ—خۆ بەکەم زانین، سەرکەش: سەرکێش.
نموونەی کەسێکی شت لەئەستۆ بگرێت و خۆی بەکەم بزانێت لەگەڵ کەسێکی سەرکێش بۆ سـڵاوی گـەرمی وەکـو کەسـێکی دڵسـۆزە کـە هـەردەم مـالی گـەرم بێـت و بیرکردنەوەشـی هەناسە ساردیە هەتا دنیا مابێ.

(٤) سراج الدین: مەبەست شێخ عوسمـان سـیراج الـدین تەوێڵەیـە، بـەها: نـرخ، شـەمس: رۆژ—مەبەست تیشکی رۆژە، حسام الدین: کوڕی شێخ عوسمانە، زیا: رووناکی.
شێخ عوسمان سراج اتلدین بەو نووری هەق و راستیەی کە هەیبوو جا ئـەو نـوورەی بەهـەر کەسێك دابێت ئەوکەسە بەهرەی لێوەرگرتبێ، ئەو تیشکە رووناکیـە پەڕیوەتـەوە بـۆ رووی حسام الدین کوڕی جا دەبێت مرۆڤ وەفا بکات بەو تروسکاییەی کە هەیەتی.

بەســــەر خـــــاکی وجــــودی تالیبــــان ئیکســـــیری ئیلتفـــات
مســی قــەلب قلــبی فــالس نــەکا گــەر عەکســی تێــدابێ[١] .

لـــە دیباجـــەی کتـــابی حســـنی عالـــەم هـــەر وەرەق لادەم
ئەبینم مبحەسی وەسـفت لەهـەر فەسـلی وە لەهـەر لایـی[٢] .

لەگــەڵ نەفســی یەزیــد وەك بایەزیــدە هــەر ئــەڵێی بۆتــۆ
موتیــع و ئـــەهل و دانـــا بــی ســـەری تەســـلیمی دانـــابێ[٣] .

---

(١) وجود: هەبوون: تالب: داواکار، ئەکسیر: چارەسەری هەموو نەخۆشی–لێرەدا مەبەست زاراوەی سوفیزمە لە مورشید قەناعەتی خەڵك بگۆڕێت، نەژادو و ئەصلی شتێك بگۆڕێت بۆ شتێکی دیکە قلب: خراپ بێ کەڵك، قلب: سەراو ژێرکردن.
بەسەر پێی و خاکی هەبوونی ئەو کەسانەی داوای شت دەکەن بۆئەوەی ئاوڕیان لێ بدەیتەوە دڵ و دەروونییان بگۆڕێ هەروەکو دڵیان وەکو پارچە مسێکی خراپ و بێ کەڵك وایە بیان گۆڕێ بۆ دڵێکی پوختە ئەگەر ئەو دڵە پێچەوانەی بیروباوەڕی تۆی تێدابێ.

(٢) دیباجە: شەرح کتیب لەزمانی عەرەبی– بە (روو) دێت، حسن: جوانی، وەرەق: پەڕ، میجەس: گەڕان بەدوای شت، فەسل: وەرز.
لەسەرتای شەرحی کتێبی جوانی عالەمدا یەك یەکە لاپەڕە هەڵدەدەمەوە دەگەڕێم بەدوای شتێکدا بەڵام لەهەموو وەرزو هەموولایەك وەسفی تۆی تێدا دەبینم یاخود لاپەڕەی جوانی هەڵدەدەمەوە هیچ لاپەڕەیەك نییە کەباسی جوانی تۆی تێدانەبێت.

(٣) یەزید: یەزیدی کوڕی معاویە، بایەزید: بایەزیدی بەسگامی عارف خواناس، موتیع: گوێ ڕایەڵ.
لەگەڵ نەفسی یەزید کە بەکوشتاری شەڕی کەربلا ناسراوە نەوەی پێغەمبەری (ﷺ) کوشت، بایەزید یوسف کە گوێڕایەڵی هەبوو بۆ ئەهلی بەیت خۆی تەسلیمی دانایی کردو سەری خۆی لەپێناوی ئەهلی بەیت دانا.

بەنـــەحو ســـەرفی دڵ تـــا ذوالفقـــارت گرتـــە نێـــو چـــەنگ
وەکـــو حەیـــدەر لەفـــەتحی خەیبـــەردا شمشـــێری کێشـــابێ[1].
بەعشـــقی شـــای ســـراج الـــدین و شـــومی بوالبهـــا جانـــا
کـــەرەم فـــەرموو وەکـــو ئیـــژەن نەزانســـتم بـــەزانایی[2].
حـــەریقی روشـــتەی جانـــت فتیلـــەی شـــەمعی جانانـــە
لەبـــەزمی پـــیری مەیخانـــە کـــزەی دڵ بـــێ مـــەزە نـــابێ[3].

---

(١) ذوالفقار: ناوی شیری ئیمامی (عەلی)یە رەزای خوای لێ بێت (لا الفتـی الا علـي لا سیف الا ذوالفقـار) ئـەوە فـەرموودەی پێغەمبـەرە(ﷺ) دەربـارەی عـەلی شمشێرەکەی، حەیـدەر: مەبەست (علـی کـوڕی ئـەبی تاڵیـب)ە کـە سـەرکردەی سـوپای موسـڵمانان بـوو لەشـەڕی خەیبەر لەگەڵ جولەکەکان بە لێکدانەوەو نەحو سەرف دڵم ژوالفقار دڵمی گرتە نێـو جـەنگی خۆی هەروەکو عەلی ی کوڕی ئەبی تاڵبیش کە سەرکردەی موسڵمانان بوو شـەڕی خەیبـەر خەیبەری خستە بەردەستی موسڵمانەکان.

(٢) بەعەشقی: بەخۆشەویستی، سیراج الدین: نازناوی شێخ عوسمان توێلەیە، شوم: نەگبـەت–ناریك، بوالبها: رێبازی بهائی سەرۆکی بەهائییەکان.
لەبەر عەشق و خۆشەویستی شێخ عوسمانی سـراج الـدین و نەگبـەتی و نـارێکی بوالبهـا تـۆ کەرەم بکەو وەکو دەڵێن زانستم نیە بەقەد زانستی ئەو سراج الدینە.

(٣) روشتە: رستە، جان: گیان، فتیلە: ئەو پارچە دەزووە کەلە نـاو مـوم هەیـە، شـەمع: مـۆم، پیری مەیخانە: لەئەدەبی سوفیزم پیری تەریقەتە.
حەریقی رستە گیانت وەکو رستەی نیو مۆم وایە کە دەسووتێ بـەوەش گیـانی گـڕی تێبـەر دەبێت پیری مەیخانەش بەزمی بادە دەگرێت کزەی دڵ دێتـە جـۆش بـەڵام کەسـێك بچێتە مەیخانە دەبێت مەزەی پێ بێت ئەگینا دڵ کزەی لێوە نایەت.

تـــا لێـــوی شــــیرینی زەمانــــە بەمـــــەزاقت نـــابێ
چـــا نییـــە ســـاقی بـــدا بـــادەو تـــۆ بڵێـــی نـــابێ[(١)].
بــــەزوخالی جگـــــەرو دودکەشـــــی ئـــــاهی ســـــینەت
هـــەر بـــەجۆش دەبـــو چـــا بـــەنێو دەمـــی کێشـــابێ[(٢)].
ســـــاقی جـــــامی کـــــەرەم دەوری عـــــەتای شـــــیرینە
بـــــا بەتالیشـــــی بـــــدا، روح لـــــەلات بیجـــــابێ[(٣)].
پـــیری مەیخانـــە ئـــەڵێ نـــەزم و مـــەقامت ئـــەوەبێ
هەرکەســـــێ دەردی نـــەبێ ســـاف و گـــەوارا نـــابێ[(٤)].

---

(١) مەزاق: زەوق، بادە: مەی، چا نییە: باش نییە.
هەتا زەمانە قسەی خۆشت لەگەڵدا بکات قسە شیرینەکانی لەلێوی بێتەدەر بەڵام ئەوە هەتاسەر بەزەوق ئارەزو نابێت بۆیە باش نییە ئەگەر هاتوو ساقی جامێك لەمەی بەتۆدا توش دەستی ساقی رەت بکەیتەوەو بڵێی نابێ.
(٢) زوخال: پاشماوەی ئاگر، دود: دووکەڵ.
بەجگەر سووتاویش کە بۆتە زوخاڵ و لەگەڵ ئەو ئاهو هەناسەت تێکەڵاو بووە بۆت دووکەڵێکی رەش لەسینەت دێتە دەرەوە، ئاو بەو جۆش و خرۆشەوە چا دەبوو ئەگەر بەنێو دەمی کێشابێ.
(٣) عەتا: بەخشین.
مەیگێڕ ئەگەر بێتو جامێك مەی پێم بدا ئەوە دەبێتە بەخشندەو لەلام گەلێك شیرینە با ئەو جامە مەی تێدابێ بەتاڵیش بێت ئەوە هەر لەلام چاکەو باشە.
(٤) پیری مەیخانە: مەبەست پیری تەریقەت، دەرو: ناخۆشی بەڵا نەخۆشی.
پیری تەریقەت دەڵێ هەتا نەزم و مەقامت ئەوەبێ و هەرکەسێکیش دەرو بەلای نەیتە رێ دڵ و دەروونی ساف و بێ گەرد نابێت بۆیە دەڵێن ئەگەر کەسێك تووشی دەردو بەڵا نەبێت لەئیمانی بترسێت.

نەقشی نامەی قەلەمی قودرەتی ئیبداع وجود
زشتی تێدا نییە گەر تۆ نەزەرت زیبا بێ[1].
بەکەمەندی غەمی دنیا کەسی خۆی پێچابێ
موتلەقی قەیدی نەکا لیفەکەی خۆی پێ چابێ[2].
جلیوەی ساقی و نەشئەی مەی و لەهمبەی موترب
فەرەحی مەجلسە تا جامی ئەدەب نەرژابێ[3].
سەرخۆشی چاو ئەوەی مەکرە لەسرکەی ئەبرۆی
قەندی لێوی مەزەیە مەشرەبی تۆ گەر چابێ[4].

---

(١) قودرەت: دەسەلات، ئیبداع: داهێنان، وجود: بوون، نەزەر: بینین، زیبا: جوان شۆخ و شەنگ.
قەلەمی قودرەت و دەسەلاتی خوا هەموو شتەکانی کۆتایی پێ هێناوە هەموو شتێك براوەتەوە هیچ گومانی تێدانییە ئەگەر بێتو تۆ تەماشا کردنت جوان بێت.
(٢) کەمەند: ئەو گوریسەی مرۆڤی پێ دەبەسترێتەوە، قەید: بەند کردن.
هەرکەسێك خۆی بپێچێتەوە بەگوریسی غەمی دنیاوە پێویست ناکات خۆی بەشێوەیەکی رەها بەند نەکات واباشە لەجیاتی ئەمە خۆی لەلێفەکەی خۆی بپێچێتەوە.
(٣) نەشئە: گەشەکردن، جلوە: خۆپێشاندان، فەرەح: خۆشی.
خۆ بەدیارخستنی مەیگێڕ و گەشەکردن مەی و نەغمەو ئاوازی گۆرانیبێژ خۆشی و بەزمی خستۆتە کۆڕو مەجلسی مەی نۆشان هەتا جامی ئەدەب نەڕژاوە.
(٤) سرکەی ئەبرۆ: سرکە شلەیەکی ترشە لەترێ یان هەنار درووست دەکرێت مەبەست برۆکانی بەڕکەوەو تووڕەییەوە سەرنجی دەدات، قەند: شەکر–مەبەست شیرینییە.
چاوە پڕ لە مەکرەکانی خەڵك سەرخۆشی دەکات و بەبرۆکانیشی دەڵێی سرکەدەفرۆشێت بەلام ئەو قسانەی لەسەر لێوەکانیەتی هێندە شیرینە دەڵێی قەندە شەکرە خۆش گرفتاری تۆش مەزەیە گەر لەگەڵم باش بێت.

مــن لەبـــەر چـــاوی وتم بـــۆ مـــەزە چـــا بـــوو لێـــوت
ئـــەو ئـــەڵێ جـــامی مەیـــە چـــا نیـــە بۆتـــۆ نـــابێ(١).

بـــێ نەواکـــەی بـــۆ ســـەدای کـــرد و وتـــی گۆیـــابێ
بـــەرەزای پـــیری موغـــان مـــوترب ئەگـــەر گویـــابێ(٢).

ئـــاوی عـــامی تەمەعـــە کەوتۆتـــە حـــالی چـــاو
چـــۆن لەبـــەر ریـــس و گوریســـی لەغـــەزەل جویـــابی(٣).

حیکمەتـــە شـــیعری مـــن و دەولـــەتی ئـــەهلی ئیمســـاك
وەك تەلەسمێکـــە کـــەریی مەســـرەفی بـــۆ نەشـــکابێ(١).

---

(١) مەزە: ئەوشتەی لەگەڵ مەی دەخورێت.
من لەبەر چاوی کەمەست بووم پێم وت لێوەکانت کە وەکو قەندی شەکر وایە قسەی شیرینی لێ دێتە دەرو دەبێتە مەزە، ئەویش دەڵێت نا ئەوە جامی مەیە بۆتۆ باش نییەو نابێت یاخود لێوەکانی دەڵێی قەندە شەکرەو شیرینە هەر بۆ چا باشەو لەگەڵی بخورێتەوە ئەو دەی نانەو چانییە بەڵکو مەیەو خەڵك سەرخۆش دەکات و بۆتۆ دەست نادات.

(٢) نەوا: ئاهەنگ، پیری موغان: پیاوانی ئایینی زەردەشت.
بەبێ ئاهەنگ و بەزم و شادی ئەو دەستی پێکردو سەدای خۆی بڵاوکردەوە پێی گوت دەست پێ بکەو بڵێ بەرەزامەندی گەورەو سەرداری و گەورانی پیاوانی ئایینی زەردەشتی گۆرانیبێژ دەست بە گووتنی بکە.

(٣) تەمەع: چاوبرسی تەماعکار، جویا: ئەوەی بەدوای شتدا دەگەرێت، فام: پێنەگەیشتوو.
هێشتا لەسەرەتادایەو پێنەگەیشتووە بەڵام چونکە زۆر تەماعکارە ئێستا کەوتۆتە حالی ئەوە کە چاوتێر نەبێت هەروەکو چۆن کەسێك هەر خەریکی ریس و گوریش بێت بەدوای شتی کۆندا بگەرێت کەونەکا بەبا بکات.

(١) حیکمەت: دانایی، ئەهلی ئیحسان: مەبەست موسڵمانان ئەهلی ئیسلامە کە رەمەزانان بەرۆژو دەبن و ئیمساك دەکەن، تەلسم: ئەوپارچە کاغەزەی فاڵچییەکان شتی لەسەر دەنووسن و نوشتەی پێ دەکەن.
شیعرەکانی من هەموو پڕە لەدانایی لەگەڵ موسڵمانان ئیسلام یەك دەگرنەوە و وەکو یەك

گەرچی دەردی سەرییە تولی کەلامی خەڵکی
من کەوا بێ غەزەلم چاکە کە سەرتاپابێ[1].
بۆ کەسی چاکە سەفینەی غەزەلی بەحری (حەریق)
گەوهەری ئەشکی هەموو رشکی دلی دەریابێ[2].

وەکو ئەو تەلسەمەی کە هیچ مەسرەفی لێ نەکرابێ و نەخشە تێدا نەبێ.

(١) دەردەسەری: بەزەحمەت—ناخۆشی، تول: درێژ، کەلام: قسە.

ئەگەرچی زۆر گوتن و درێژەپێدانی قسەی خەڵکی هەر دەردەسەری و ناخۆشییە بەڵام من بێ قسەم و ئەوە چاکە ئەوە هەتا سەربێ.

(٢) سەفینە: کەشتی، بەحر: دەریا، گەوهەر: مادەیەکی بەنرخە، ئەشک: فرمێسک، رەشک: حەسوودی.

بۆکەسێك ئەوە باشە کەکەشتی قسەو غەزەلی لەدەریابێ حریقی چونکە دەریا گەوهەری تێدایە هەموو فرمێسکی چاویش حەسوودی پێ دەبردرێ گەر بەقەد ئاوی دەریابێ.

ئیقتباسـی نەفەسـی هیمـەتی ئـەولادی بـەتول
وەکـو میسـباحە کـەس مـالی دڵـی ئـاوابێ[١].
نـەك وەکـو زاهیـدی وشـك بەتـەواوی ریـابێ
هێنـدە ناپاکـە بەسـەد ئـاوی بشـۆی پانـابێ[٢].
وەفـای مـن بـێ بـەها بـوو بـۆ رەواجـی مامەڵـەی یـارم
رەزام یـارم کەداویـە بەچـیت و فـیتی بـازاری[٣].
لەسـەودا دا رەشـیدە تـالبی قـازانجی ئەشـیایە
هـەتا زووتـر لەناوچـی چـاکە ئەجناسـی وەفـاداری[٤].
مـەتاعی مەعریفـەت جنسـی وەفـا فەسـلی نـەما فـەوتا
ئـەمن نـابودی ئـەو بـووم نـا بەلـەد بوومـە خریـداری[٥].

---

(١) ئقتباسی: وەرگرتن، ئەولادی بەتول: منداڵی فاطمە کچی محمد (ﷺ) میسباح: چرا.
هەرکەسێك نەفەسێکی لەمنداڵانی حەزرەتی فاطمە (حسن و حسین) وەرگرتبێت وەکو ئەوەیە چرایەکی لەماڵی خۆی هەڵگیرساندووە و بەوەش ماڵی ئاوەدان دەبێت.
(٢) زاهید: خواناس، ریا: بۆ غەیری خوا، پانابێ: کورتکراوەی پاك نابێ.
نەك وەکو کەسێکی خواپەرستی وشك کە بەتەواوی ئیش و کارەکانی بۆ غەیری خوایە ئەوەش هێندە پیس و ناپاکە ئەگەر بێتو بەسەد ئاوی بشۆی خاوێن نابێت.
(٣) بێ بەها بوو: بێ سوود بوو، رەواج: برەو پێدان.
ئەو سۆزو وەفاییەی کە هەمبو بەرامبەر سەوداو مامەڵەی یارم بێ سوود بوو رازیم بەو چیت و فیتەی بازاڕ کە یارم هەمووی فرۆشت و لەناوی برد.
(٤) سەودا: ئالووێر، رەشید: ئازا، ئەشیا: کەلوپەل، ئەجناس: کۆی جنس–رەگەز.
لەئالووێر مامەڵەدا گەلێك ئازاو بوێرە و هەردەم داوای قازانجی کەلوپەل دەکات هەتا زووتر لەنابچێ و نەمێنێ باشترە وەفاداری.
(٥) مەتاع: کەلوپەل، نابود: گزول بێ دەسەڵات، خریدای: کڕیار.
هەرچی کەلوپەلی زانست هەیە لەرەگەزی وەفا هیچی نەماو هەموو فەوتاو رۆیشت، ئەمن بێ دەسەڵاتی ئەوبووم بەنا بەدڵی بووم بەکڕیاری.

رەواجـی نەقـدی عەهـدی سـکەی دیرینـە فـەوتاوە
بـە ئەسکەناسـە ئیسـتە مامەلـەی بـازاری مـەکاری[١].
بینـای خانـەی وەفـا وەك تـاقی کیسـرا گـونگرەی رووخـا
ئـەمن تـازە تـەنافی جـووت ئەکـەم بـۆ تـەرحی مـەعماری[٢].
قسـەی تـرش و قسـەی خۆشـم ورێنـەری حـالی ناخۆشـە
بـەبێ کـەیفی لـە زۆرو کـەم خەبـەر داریـنم لەمیقـداری[٣].
لە دەسگای نەگبەتا هەرکەس چـووە سـەر تـەختی بەدبـەختی
نـەدیم ئیقبـالی ناگـا بـۆ وەزارەت بەسـیە ئیـدباری[٤].

---

(١) رەواج: برەو، نەقد: پاك کردنەوە، ئەسکەناسی: پارەی کاغەز.
ئەو رەواجەو برەوەی کە جاران هەبو بۆ پارەی سەردەمی کۆن و دێرین بە پـارەی کاغـەزی ئێستە کە هەیە کرین و فرۆشتنی بازاڕی پێدەکرێت.
(٢) تاقی کیسرا: بەناوبانگترین کۆشکی پاشایەتی بنەماڵـەی پاشـاکانی ساسـانی بـووە گوایـە خوسرەوی یەکەم درووستی کردووە هەندێکی دیکە دەڵـێن هـی یەکەمـە، ئـەو تاقـە درێـژی ٤٠٠م و پانیەکەی ٣٠٠ م، تا ساڵی ١٨٨٨ز دیمەنی هۆڵی گـەورەی ناوەنـد مـابوو ئـەو هۆڵـە ٢٥,٦٣ پانیەتی و ٤٣,٧٢ درێژیەتی، نزیك بغدادیە لەسەلمان پاك.
هەرچی وەفا هەبوو هیچی نەماو رووخا هەروەکو تاقی کیسرا چەند پتەو بوو رووخا، منیش تازە بەتازە رستە رێك دەخەم کەچۆن بینا درووست بکەم.
(٣) قسەی خۆش و ناخۆشم هەروەکو ئەوەیـە کەسـێك ئاگـای لـەخۆی نـەبێت و قسـەبکات کـە ورێنە پێ دەڵێن بەبێ کەیف و خۆشی کەم و زۆر ئاگادار نیم.
(٤) ئیقبال: پێشوازی کردن، ئیدبار: پشت تێکردن و روو لێ وەرگێڕان.
لە دام و دەزگاکانی نەگبەتیدا هەرکەسـێك چـووە سـەرتەخت بەدبـەختی یەخـەی دەگرێـت نەمدیوە کەسیش پێشوازی لەو وەزارەتە بکات ئیتر بەسیە هەتا کەی ئەو پشـت تێکـردن و روو لێ وەرگێڕانە.

شـــەوانە لازمـــە تەشــریفی مـــەنزل بـــۆ کەســـانێکە
خـــەریکی ئیســـراحەت بـــن بـــەنازو نیعمـــەتی ســـاری[١] .
هـــەزار حـــەیفی (حـــەریقی) کـــە بـــەزەوقی خـــۆم نـــەبوو جـاریٚ
بڵـــیٚ بـــەخوا زەریفـــت وت بەمەســـتی یـــا بەهوشـــیاری[٢] .
بەخـــــەیاڵی شـــــەوی وەســـــڵت خـــــەوی هیجـــــرانم دی
بـــــە شـــــەمیمی نەفەســــــت ســــــروەی حیرمــــــانم دی[٣] .
چـــــاوی بیمـــــارت ئیشـــــارەتی شـــــیفا ئـــــەنوێنیٚ
لەخـــــەتی مەســـــحەفی رووت ئایـــــەتی لوقمـــــانم دی[٤] .
ســـەیری زوڵفـــت کـــە لەســـەر ئـــاگری زوڵفـــت ویســـتاوە
حـــــەیی بـــــیٚ جانـــــە لەبـــــەر چـــــاو و بەپـــــەیمانم دی[٥] .

---

(١) شەو لازمەو پێویستە هەرکەسێك تەشریف بکات و بێتە میوانی ماڵەوە ئەگەرنا دەبێت ئەوانیش لەشەودا ماوەی حەسانەوەیان هەبێت بەو نازو نیعمەتە بەردەوامەکەی کە هەیە.

(٢) حەیف: بەداخەوە: مەست: بیٚ هۆش، هەشیاری: بەئاگایی.
هەزار جار بەداخەوە حەریقی کەهیچ جارێك لەجاران بەزەوق مەبەستی خۆم نەبوو هەتا بڵێن دەمت خۆش زۆر باشت گووت بەبیٚ هۆشی چ بە ئاگایی و هوشیاری.

(٣) وەسل: گەیشتن، هیجران: دووری لەدۆستان، شەمیم: بۆن، سروە: شنەبا، حیرمان: بیٚ ئومێد.
بەدرێژایی شەو هەردەم لەفکرو خەیاڵی ئەوەمە کە پێت بگەم تاکو خەوم لیٚ کەوت لەخەوما خەونم بەدووری تۆوە دی بەڵام بەبۆنی نەفەست تووشی نائومێدی کردم.

(٤) بیمار: نەخۆش، مەسحەف: کتێب، ئایەت: نیشانە، لوقمان: لوقمانی حەکیم.
بەئاماژە کردنی چاوی نەخۆشت کەوا شیفای بۆدێت لە یەکە یەکەی دێرەکانی کتێبی رووت کە هەموو شتی تێدا نووسراوەتەوە نیشانەو ئامۆژگاریەکانی لوقمانی حکیم بینی.

(٥) حەیی: مار، بیٚ جانە بەبیٚ گیانە.
وەرە سەیری زوڵفت بکە کە چۆن شۆڕ بۆتەوە بەسەر رووت رێك و راست راوەستاوە بەسەر رووی ئاگریت کە دەدرەوشێتەوە ئەوەش هەردەڵێی مارێکی بیٚ گیانە لەبەرچاو بۆیە داوای پەیمانم لیٚ کرد.

بەهـــەوای عەرعـــەری قـــەددت لەخـــەیابانی خـــەیال
شـــیعری بەرجەســـتە وەکـــو ســـەروی خـــەرمانم دی[1].
روخـــی نـــەورۆزی نـــەبو خێـــز خـــەتی ماتـــەمی گـــرت
رۆژی ئیمســـــاك و شـــــەوی قـــــەدری حـــــەبیبانم دی[2].
بەخـــەیاڵ چـــوومە گولســـتانی ئـــیرەم بـــێ گـــولی روت
دوور لـــە شـــەوقی روخـــی تـــۆ کەلبـــەی ئـــەحزانم دی[3].
گەوهـــەری مـــەعنا لـــە دەریاچـــەی دڵ دێنمـــەدەر
تـــا لەحوقفـــەیی دەهنـــت لـــەعلی بەدخشـــانم دی[4].

---

(١) عەرعەر: لوتکەی دار لەئەدبیات بەقەدی جوانی یار دەگوترێ، خەیابان: شەقام.
هـەر بەخۆشەویسـتی قـەدی باریـك و رێـك و جوانـت لەسـەر شـەقامی خـەیاڵ دەرۆم ئـەو شیعرانەش هەموو بەرجەستە کراوە کە ئەو قەدو باڵات هەروەکو داری سـەرو بـەرز و جـوان یاخود ئەو هێلە گەشەیە کە چواردەوری مانگی داوە.
(٢) روخ: روو دەمـو چـاو، نـەوخێز: تازەپێگەیشـتوو، رۆژی ئیمسـاك: رۆژی رەمـەزان، شـەوی قەدر دە رۆژە تاکەکانی مانگی رەمەزان، حەبیب: خۆشەویست.
دەموچاوی گەشی وەکو ئـاگری نـەورۆز دەدرەوشـێتەوە ئـەو دەموچـاوە گەشـە کـە تـازە پێگەیشتووە خەریکی ماتەم گرتنە رۆژی رەمەزان و شـەوی قـەدر لەهـەردووکیان دۆسـت و خۆشەویستان دەبینم.
(٣) گولسـتانی ئـیرەم: باغچـەی ئـیرەم شـەدادی کـوڕی عـاد درووسـتی کـردووە بەبەهەشـتی شەدادیش بەناوبانگە بە خەیاڵی خۆی ئەوەی لەبەهەشت هەیە لەوێش هەیە، ئەحزان: خـەم و خەفەت.
بەخەیاڵ چوومە باغچەی ئیرەم بەڵام بێ ئەوەی گوڵی رووت لەگەڵمدا بێت هەروەها دوور لە شەوق و جوانی روو و دەموچاوی تۆ سەگی خەم و خەفەتم دی.
(٤) حوقە: سندوقێکی بچووك کە شتی گرانبەهای تێدا هەڵدەگیرێ، دەهن: دەم.
هەرچی شتی گران بەها هەیە وەکو گەوهـەر لـەدەریای دڵ دەیهێنمـە دەرەوە دەمـت هـەر دەڵێی ئـەو سـندوقەیە کەشـتی گرنـی تێدا هەڵدەگیرێ واتـە ئـەو شـتانەی لـەدەمت دێتـە دەرەوە هەروەکو لەعلی بەدخشان وایە.

هــەر بــەئاودا چــوو ســەفینەی غــەزەلی بــەحری خــەیاڵ

لـــــەجیاتی ســــــوودی مــــــەتاعم زەرەرو زیــــــانم دی[١].

لەیـــــەکن دیــــدەی فتیلـــــەی مـــــژدەو روغــــن ئــــاه

بــــۆ شـــــەوی وەســــلی لــــه ســــەدلاوە چــــراخانم دی[٢].

لەنـــــەوای تەغنیـــــــە بولبـــــولی دەوری گــــــوڵ رووت

لەهــــــەموو مــــــورغی چــــــەمەن ناڵــــــەو ئــــــەفغانم دی[٣].

گەوهـــــەری نـــــەزم و دوری مـــــەعناو لـــــەفزی ســــــەدەفم

بــــــردە بــــــازاڕی نــــــەزەر موشــــــتەری نــــــادانم دی[٤].

---

(١) خەیاڵم وەکو دەریایە و سەفینە غەزەل تێدا هاتوچۆ دەکات جا ئەو شتانەی کە هەم بوو هەموو بەئاودا رۆیشت جا لەجیاتی ئەو سوود لە کەلوپەلەکان وەربگرم زەرەرو زیانێکی گەورەم کرد.

(٢) دیدە: چاو، فتیله: ئەو دەزوەی لەناو نەوت دایەو ئاگری تێبەر دەدرێت بۆ رووناکی، روغن: رون، چرا: رووناکی.

هەردوو وەکو یەکن فتیلەو چراو لەگەڵ ئەو رۆنەی کە دەسووتێ ئا لەو شەوەی کە بەتۆ گەیشتم تۆم بینی لەسەدلاوە چرام دی گە دەوروپشتی رووناك کردبنەوە ئەوشەوە بەهۆی چراخانی تۆوە بدە رۆژەی رووناك.

(٣) نەوا: ئاواز، تەغنیە: گۆرانی، مرغ: باڵندە، ئەفغان: گریان و شیوەن.

لەئاوازی گۆرانی بولبول کە دەڵێ بەگوڵی رووت لەهەموو باڵندەکانی چەمەن گوێم لەدەنگی ناڵەو گریان و شیوەن بوو.

(٤) هۆنینەوەم هەروەکو گەوهەرە لەماناشدا هەروەکو دوڕە دەبرینیشم وەکو گیانداری سەدەف وایە لەناو دەریادا ئەوانەم هەموو بردە بازاڕ بۆ ئەوەی بیبیان فرۆشم بەڵام کڕیار نەبوو.

لەقوبالـــەی کـــەرەمی ئـــەهلی هونـــەر تـــیَ فکـــریم
وەکـــو ئەشـــعاری (حـــەریقی) خـــەتی بـــوتلانم دی[1].

(١) قوباله: بەرامبەر، کەرەم: بەخشندە، ئەشعار: دروشم.
لەبەرامبەر ئەو کەرەم و بەخشندەی ئـەهلی هونـەر ورد بوومـەوە تـێ فکـریم ئەوانـە وەکـو دروشمەکانی حەریقی وان بۆیە خەتی خوارو خێچم بینی کەمووی تازە هـاتووی دەموچـاوی گەنجانە.

لەخـــەرمانی ئەمــەل مێــروی عەمــەل جــەزبی نــەکرد دانــیٚ
لەزەیقــەت خانــەدا ترســم هەیــە ئــاخر ســەری دانــیٚ [١].
ئــەڵێن جــەردەی ئەجــەل رێگــا بــەکاروانی نەفــەس ئــەگریٚ
شــەقامی ســینە دەبــڕیٚ بــۆ مــەتاعی دیــدە ئــەڕوانیٚ [٢].
تەریــدەی نــەفس و شــەیتان قافلــەی تاعــاتی غــارەت کــرد
ئەگــەر جاسووســی ئیمــان نــەبیٚ دەرناچــیٚ ئینســانیٚ [٣].
تــەرازووی تاعــەت لەنگــە هەتاکــەی ئــەم ســەرو ئەوســەرتە
بــەپار ســەنگی حــەیا دەس هــەڵبڕە بنــوارە میزانــیٚ [٤].

---

(١) خەرمانی ئەمەل: دەست کەوتنی هیواو ئارەزوو، جەزب: راکێشان، زەیقەتخانە: ماڵی تەنگ و ناخۆش.
لەبەدەست هێنانی و دەست کەوتنی هیواو ئارەزوو کردەوەکانـدا ئـەو هـەموو ئیشـە بـۆلای خۆی رانەکێشا ترسی زۆرم هەیە لەو ماڵە تەنگ و تاریکەدا دواجار سەری خـۆی تێدا دانیٚ (دەبێت ماڵی تەنگ و تاریك مەبەستی گۆڕ) بێت.
(٢) جەردە: رێگر، مەتاع: کەلوپەل.
دەڵـێن ئەجـەل رێگـرەو هـەرجاریٚ رێگـا بـەکاروانی نـەفس دەگـریٚ و دەیکوژیٚ هەربۆیـە شەقامی سینە دەبڕی و چاو دەگێڕیٚ بۆ کەلوپەلی بەرچاو تاکو بیگرێت.
(٣) تەریدە: دزو رێگر، قافلە: کاروان، غارەت: تالان کردن.
دزو جەردەو رێگری نەفس و شەیتان هەرچی کاروانی تاعەت هـەبوو هـەمووی بـەتالان بـرد، جا ئەگەر جاسووی ئیمان نەبیٚ هیچ کەسێك لەو دزو جەردەیە رزگاری نابێت.
(٤) تەرازوو: کێشانە، لەنگە: ناهاوسەنگ، پارسەنگ: هاوسەنگی راگرتن.
کێشانەی تاعەت و خواپەرستی نـا هاوسـەگە جـا هەتاکـەی ئـەو سـەرو ئەوسـەری دەکـەی کێشـانەکە هاوسـەنگ ناکـەی جـا پارسـەنگی حـەیاو شـەرم بگـرەو دەسـت هـەڵبڕە ئینجـا تەماشای کێشانە بکە.

بــەس بــێ تاعــەتی رووکــەش مەڵــەک ســەرافی ئەعمالــە
موحەســیل نەقــدی قــەلب و نــارەوا ناباتــە دیــوانی[١].
ئــەوا بــەردی ئەجــەل هــات و لەشوشــەی عومریداســاقی
بــــەقوربانی پیالــــەی چــــاوەکەت بم تێکــــە فنجــــانی[٢].
حــەیات خــۆ چــوو لــەنیو جامــەی حــەیاتی عاریــەت بــی عــار
ئــەوا داوای ئەکــەن چ بکــەم (حــەریقی) رێگــەی رجــا کــوانی[٣].

---

(١) رووکەش: بەرچاو ریا، مەلەك: مەلائکەی گیان کێشان، موحەسیل: بەدەست هـاتوو، نقدی قلب: جیاکردنەوەی پارەی تەزویر لەپارەی دیکە.
بەسە هەتاکەی خواپەرستی لەبۆ ریایی ئەوە مەلائکەی گیـان کێشـان هـەموو کردەوەکـانی خوردەکاتەوە کردەوەی چاك لەهی خراپ جیادەکاتەوە جا ئـەوەی بەدەست دێت پـارەی دروسـتەو ئـەوەی دیکـە ناباتـە دیـوان کـردەوەش هەروایـە ئـەوەی بـۆ خوایـە وەردەگـیرێ ئەوەی دیکە بەروویدا دەدرێتەوە.
(٢) بەردی ئەجەل هات لەشوشەی دڵی داو شکاندی هەروەکو چۆن بەرد بەشوشـە دەکـەوێت و دەشکێت ئەجەلیش هات دڵی لەلێدان راوەستاند جـا سـاقی بـەقوربانت بم تێکـە فنجانێك هەتا ئەو بەردە نەهاتووەو بەشوشەی دڵم بکەوێ.
(٣) ژیان هەموو تێدا چوو لەنێو جامەی ژیانی رووتی رەجالی ئەی کەسی بێ عار ئەوا داوام لـێ دەکەن ئێستا چ بکەم حەریقی کوا ئێستا کاتی رجایە کاتی رجاش بەسەر چووە.

لەگۆشـــەی گولخـــەنی تـــەن تابەکـــەی ئیمـــانی حوســـیانی
بـــەئیمانی شـــهودی بێـــرە نێـــو ئەســـراری ســـوبحانی[١].
مـــەڵێ تاریکـــە ڕێگـــەم پەرچـــەمی پـــڕ خـــەم دەبەســـتی ئـــەم
شـــوکر وەك ڕۆژی ڕووناکـــە ســـفیدەی ســـوبحی پیشـــانی[٢].
دەمێکـــە هـــەروەکو بولبـــول لەســـەر چـــڵ سەرچـــلی شـــێتی
زەمـــانێکیش وەرە ســـەیری نـــەمامی بـــاغی عوسمـــانی[٣].
ختـــورەت ڕێـــی حـــوزوری بەســـتوی بـــو مـــەجلس بـــاقی
دەترســـم قـــەد نـــەبێ لاقـــی کـــەوا تـــاقی دڵـــە فـــانی[٤].

---

(١) گوڵخەن: کورخانی گەرماو، شهود: کۆی شاهیدە دلبەر، ئەوەی شت دەبینی دەگێڕێتەوە، سوبحان: بەدڵسۆزی یادی خواکردن، ئەسرار: کۆی سرە نهێنی.
هەتاکەی لەگۆشەی کولخانی گەرماودا ئیمان بە بە ئەسل و نەسەب بێت بەئیمانی ئەوەیە شتێك ببینیٚ لە دلبەرەکەت کە هیچ شتێك بەنهێنی نابێت تەنها خودا پەرستی نەبێت.
(٢) سەفیدەی سوبح: ڕووناکی بەرەبەیانی.
مەڵێ ڕێگا تاریکە چونکە دولبەر پەرچەمی ڕێگا دەگرێت چونکە پەرچەم ڕەشەو تاریکایی لەڕەشەوە هاتووە، ئەو پەرچەم ڕێگای خەم دەبەستێ شوکرو سوپاس بۆ خوای گەورە ڕۆژەکەی گەش و ڕووناکی هەروەکو ڕووناکی بەرەبەیانی.
(٣)هەروەکو چۆن بولبول شێت و شەیدای سەرچلە بۆ ئەوەی لەسەر ئەوچڵ بخوێنیٚ تۆش بولبول ئاسا شێتی سەرچڵی، کەوایە ماوەیەکیش وەرە و سەیری نەمامی باغی عوسمان بکە.
دەبێت باغی عوسمان مەبەست ئەو کەسانە بێت بەتایبەتی شێخ یوسف شمس الدین کە پیری حەریقی بووە باغی عوسمان مەبەست شێخ عوسمان سیراجەددین بووە لەبەردەستی پێگەیشتووە.
(٤) ختوورەت: بەبیرهاتنەوە، حزوری: ئامادەبوون.
بەبیرهاتنەوەی تۆ ڕێگای بەستووە و گیراوە لەئامادەبوونی تۆدا کە بچیتە ناو کۆڕو مەجلیس لەوە دەترسم قەد لاقی نەبێت بۆئەوە بگاتە ئەو دڵە لەناو چووەی خۆی.

هەتاکەی تۆ لەغەفلەت دا دەنۆشی ژەهری خاموشی
ئەگەر عەقڵت هەبێ بەسیە زەمانی جەهل و نادانی [١].
وەکو شانە هەتا جەمعە خەیاڵت بۆ پەرێشانی
بەدیدارت قەسەم ئاخر پەرێشان و پەشیمانی [٢].
دەبینم هەرکەسێ توحفەی خولوسیەت لەگەڵ تاعەت
دەبا بۆ خزمەتی مورشید بەقەلبی پاکی نورانی [٣].
منیش باری خەجالەت وا لەسەرشانم کە ناتوانم
لەژێر پاپی لەبەردپێ نێم خودا هەرتۆ کە رەحمانی [٤].

---

(١) خامۆش: هێمن و ئارامی ئاگر کە گڵپەی نەمێنێ دەڵێن ئاگرەکە خامۆش بووە.
هەتاکەی تۆ لەبێ ئاگاییدا دەژی و لەنێو خۆتدا ژەهری بێ دەنگی و ئارامی دەنۆشی هەروەکو ئەو ئاگرەی گڕی گەرمی تێدا نەمابێ تەنها ئاگردانێکی ساردو سڕە جا ئەگەر تۆزێك عەقڵت هەبێ بەسەو سەردەمی نەزانی و نادانای بەسەرچوو.
(٢) پەرێشان: بەرش و بڵاو لەئەدەبیات بۆ زولفی ئاڵۆزو شێواو بەکاردێت.
هەروەکو شانە چۆن موەکانی سەر رێك دەخات بیری تۆش ئەوها کۆبۆتەوە لەسەریەك شت چاکە وایە بۆ هێندە پەراگەندەی سوێند بە دیدارت بێت کۆتاییەکەی ئەوها پەرش و بڵاو دەبێت هەتا پەشیمان دەبێتەوە ئەوکاتەش پەشیمانی سوودی نابێت.
(٣) توحفە: شتی بچووك و بەنرخ، خلوسیەت: دلسۆزی.
هەرکەسێك من دەبینم شتێك بەدڵسۆزی بکات وەکو شتێکی بچووك و بەنرخ لەگەڵ خواپەرستی ئەوشتانە دەبات بۆ خزمەت مورشیدی بەدڵێکی پاك و نوورانی.
(٤) خەجالەت: شەرمەزاری، رەحمان: میهرەبان یەکێکە لەناوە جوانەکانی خوا.
من بارێك شەرمەزاری لەسەر شانمە، کە ناتوانم ئەوپارە هەڵبگرم جا وا باشە ئەوانە هەموو لەژێر پێدا بنێم خودایە تۆش پشت و پەنام بیت چونکە خۆت میهرەبانی.

خیتاباتی جەدەل ئەمڕۆ یەقینە سەختەی مەحزە
نەتیجەی ئەوەلی فکرم قیاس کەوتە بورهانی[1].
ئەڵێن هاتۆتەوە شەخسی بە ئیسمی ئەشرەفی عالەم
جەنابی سەیدی ئەکرەم شەفیعی قاس و دانی[2].
لەکەعبەی عارفان هەرئەو لەبۆ زومرەی موریدانی
فیوزاتی نەسیبی عالەم موشتاقی خۆی هانی[3].
بچین بۆ خزمەتی چاکە بە ئیسلاحێکی مەردانە
دوعامان بۆ بکا بەلکە لەشەڕی نەفسی زولمانی[4].

---

(١) ختابات: کۆی ختاب قسەو وتووێژ، جەدەل: گفتوگۆیِ تیژو تون، مەحزە: بەخالسی پاك.
ئەمڕۆ قسەو وتوێژیِ تیژوتوند بەخالسی بۆ شتی هیچ و نادروستە دەرەنجامی یەکەمی بیرکردنەوەم وەکو پێوەرێك کەوتە سەلماندنی قسەکان دەکرێت بورهانی مەبەستی شێخ بورهانیش بێت کە بیرکردنەوەی جاری یەکەمی راست دەرچووبێت کە شێخ بورهان دوورە لە گفتوگۆی نادرووست.
(٢) دانی: نزیك، قاسی: توندوتیژ، ئیسمی ئەشرەفی عالەم: ناوی گەورەی جیهان.
دەڵێن هاتۆتەوە کەسێك بەناوی گەورەی هەموو جیهان بەرێز گەورەی رێزگیراو تکاکاری نزیك دوور دەبێت مەبەستی پێغەمبەر بێت (ﷺ).
(٣) عارفان: خواناسان (کۆی عارف)ە، زومر: کۆمەڵ–دەستە، خویز: بەهرە، موشتاق: پەرۆش–ئارەزوومەند.
لەکەعبەی خواناساندا هەر ئەو لەدەستەو کۆمەڵەی موریدانەو بەهرەو نەسیبی جیهان ئارەزوومەندانی خۆی بۆ هێناین.
(٤) ئیسلاح: چاك خواز.
واباشە بچین بۆ خزمەتی بە هیواو چاکە خوازێکی مەردانە دوعامان بۆبکات بەلکە لەشەڕی نەفسی زاڵمان بمان پارێزی.

وەکــو پەروانــە هــەر لــەحزە (حریقــی) شــەمعی جــەمعێکم
خــــوا کــــەی منـــــەوەربم بــــەنووری مــــاهی تابــــانی[1].

(١) ماه: مانگ، تابان: درەوشاوە، هەر لەحزە: هەرکاتێك.
من هەروەکو پەپوولە لەهـەرکاتێك حـەریقی وەکـو مـومێکم کـەکۆیان دەکەمـەوە هـەروەکو چۆن پەپولە لەدەوری مۆم دەسووڕێتەوە عەشقی ئاگرە تاکو خۆی دەسووتێنێ خوایـە کـە درەوشاوەبم بەو رووناکییەی وەکو مانگی درەوشاوەیە.

خــوا لەدەســـت شــۆخى كـــەوەختى عيشــوە ئـــەنوێنێ
ســررى تۆبــەى مــەلاو راهيــد بەنۆبــەى جلــوە ئەشــكێنێ[1].
ســـــتوونى قامــــەتت راگرتــــووە بــــەخيوەتى ديــــنم
خــوا بــۆ طــولى عــومرت ئــەو تــەناف و دارە ناپســێنێ[2].
لـــە رەمـــزا حكمـــە العـــين ئيشـــارەى چـــاوى بيمـــارى
بـــەقانوونى ئـــەدەب ئايـــەى شـــيفا بۆئێمـــە ئـــەخوێنێ[3].
نەخۆشـــى دەردى هيجـــرانم، وســـالى تۆيـــە دەرمـــانم
شـــيفام نـــايى مەگـــەر بـــۆنى نەســـيمى پەرچـــەمت بـــێنێ[4].

---

(١) عيشوە: ناز فرۆشتن يان كارى شاراوە، جلوە: ئاشكرا كردن.
هاوار خوايە لەدەست شۆخێكى جوان و ناسك كەكاتێك ناز دەفرۆشێ خۆى بەناز پێشان دەدات، بەونازەى خۆى هەرچى نهێنى تۆبەى مەلاو زاهيدان هەيە ئەوجارە بەئاشكرا كردن دەشكێنێ.

(٢) گول عومرت: تەمەن درێژى، تەناف: رستە.
قەدو بالآت هێندن رێك و پێكە هەروەكو كۆلەگە وايە كاتێك دەدرێتە ژێر رەشمالْ و رەشمالّى پێ رادەگيرێ ئايينى منيش وەكو ئەو رەشمالّە وايەو تۆش بويتە ئەو كۆلّەگەيە بۆ راگرتنى دينم، خواى گەورەش تەمەن درێژيت ئەو رستەو كۆلّەگەيە ناپسێنێ و راگيرى دەكات.

(٣) رەمز: رازى نهێنى، حكمە العين: دانايى و ئامارْەكردن بەچاو تێگەين لە ئامارْەكردنى چاو، بيمار: نەخۆش.
بەدانايى و تێگەيشتن و فەلسەفەى چاوەكانى هەرچى رازى نهێنيەكانى چاوى ئيشارەى كرد كە نەخۆشەو پێويستى بە شيفا هەيە بۆيە بەياساى ئەدەب ئايەتى شيفا هەيە دەخوێنێ

(٤) هيجران: دوورى، وسال: بەيەك گەيشتن، نەسيم: شنەبا.
نەخۆشم دەردى جودايى تۆم هەيە، دەرمانى ئەو نەخۆشيەم بەيەك گەيشتنى تۆيە شفام نابێ تەنها بەهاتنى شنەى بايەى كە بۆنى پەرچەمتى لێوە دێت.

خـــەیالی نـــەو بـــەهارو ســـەیری گـــولزاری عزیـــزانم
گـەهی بـو رووی گـولْ گـاهیْ لـەبۆ سـەبزەی خـەتم دێـنیْ[١].
زرێـــی زولْـــف و مـــوژەی تـــیرو بـــرۆی شمشـــێری راکێشـــا
لـــەزومرەی عاشـــقانی خـــوێن بـــەهای روخســـاری دەســـتێنیْ[٢].
لـــەرێی بـــادەی پیاڵـــەی چـــاو شوشـــەیی گـــەردن ســـاقی
کەســـی گـــەر ئـــابروی بـــیْ رەنگـــە جـــامی عەیشـــی بـــرژێنیْ[٣].
ئـــەزانیْ بـــۆ تـــەرازوی زولفـــی ســـەرناکا لـــەهیچ لاوە
بـــە پارســـەنگی حـــەیا دەســـتی لـــەمیزانا ئـــەبزوێنیْ[٤].

---

(١) خـەیالْ و بیرومۆشـم هـەر لـەلای بـەهاری تـازەو جواندایـە کەسـەیری ئـەو بـەهرە دەکرێت لەدۆسـت و برادەرانـی خۆشەویسـتم جـارێکی بـۆ رووی گـولْ دەروانم و جـارێکیش بـۆ سەوزەگیانی تازە سەردەرهاتووی سەردەردێنیْ.

(٢) زریْ: ئەو ئاسنەی شـەرکەر بەسـەر سنگیدا دەهـێنیْ بۆپاراسـتنی لـەتیری دوژمـن، مـوژە: برژانگ، خوێن بەها: نرخی خوێن.
زولفەکانی هەروەکو زریْ وایە بۆ پاراستنی رووی گەشی و مـووی برژانگەکانیشـی هـەروەکو تیر وایە و کاتێك تیر دەهاوێت جەرگ دەپێکیْ و برۆکانیشی شیری لیْ راکێشـا لـە دەسـتەو تاقمەی عاشقان داوای نرخی خوێن لەروخساری دەکات.

(٣) بادە: مەی، عەیش: کامەرانی و خۆشی.
لەرێگای پیاڵەی چاو و گەردەنی شوشەیی ساقی پیالە پڕ لە مەی بکـە، گـەر هـەر کەسـێك ئابرووی هەبێت رەنگە خۆشی و کامەرانی لەوکاتەدا برژێنیْ.

(٤) تەرازوو: کۆمەڵە ئەستێرەیەکە لەئاسمان بورجی حەوتەم.
ئەزانی زولفی ئەولاو ئەولا ناکات لەنێوان ئەستێرەکانی ئاسماندا چونکە پارسـەنگی حـەیای راگرتووە دەستی لەناوەراستدا ئەبزوێنیْ.

(حـــەریقی) نـــاری هیجـــران و غـــەریقی ئەشـــکی حیرمـــانم
ئەگـــەر ئـــەم بـــێ ئـــەخنکێنێ ئەگـــەر ئـــەوبێ ئەســـووتێنی(١).

(١) نار: ئاگر، هیجران: جودایی، غەریق: نقوم بوو، ئەشك: فرمێسك، حیرمان: نائومێدی.
حەریقی کەوتۆتە ناو ئاگری دووری جودایی لەلایەك لەلایەکی دیکەوە نقوومی فرمێسکی نائومێدی بووە جا ئەگەر نقومی فرمێسکی نائومێدی دەبێت ئەوە دەخنکێ و ئەگەر لەناو ئاگرە ئەوە دەسووتێ.

لــەلام وابــوو کـــە تـــۆ ســـەید رەشـــید یـــار بـــۆ یـــاری
لــــــەمولکی میهرەبانیـــــدا لـــــە یـــــارانی وەفـــــاداری[١].
لەگــەڵ هــەر زەرە بــۆ جلیــوەی جــەلای میهــری جیهــان ئــارا
لەشــۆقی مشــتەری نــووری قەمــەر وەك زوهــرە ســەبیاری[٢].
جیــواری رەحمــەت و دەســگاه پیشــتگای عــەدل و ئینســافی
لــە دەربــارەی فــەقیران راســت ئــەمین و ئــەهلی دەربــاری[٣].
لـــە زومـــرەی چاوەشـــانی بارەگـــای بـــاری ســـەلای عـــامی
لە حەلقەی مەهوشان سەرخۆش و هەم مەست و هوشـیاری[٤].

---

(١) باس لە کەسێك دەکات کەناوی (سەید رەشید)ە.
من وا هەستم دەکرد سـەید رەشـید کـە تـۆ یـارێکی بۆیـاری کـردن بـوو، لەبەخشـندەیی و میهرەبانیدا لە دۆستە وەفا دارەکانی، لەنێوان یاری و یاری جناس مطابق هەیە.
(٢) جلیوە: خۆ بەدیارخستن، جـەلا: ئاشـکرابوون، جهـان ئـارا: جیهـان رازاوە، قەمـەر: مـانگ، زوهرە: یەکێکە لە ئەستێرەکانی کۆمەڵەی خۆر، میهر: خۆشەویستی.
لەگـەڵ بەدیارخسـتن و ئاشـکراکردنی هـەر زەرەیـەك لـە خۆشەویسـتی ئـەو جیهانـەی کـە رازاوەتەوە لەشەوقی موشتەری رووناکی مانگ و هەروەکو زوهرە لە هاتوجودایی.
(٣) جیوار: بەناو داڵدەدان.
ئەتۆ کەسێکی پەنان و داڵدەی رەحمەتی و دەزگای خێرو پیشـاندانی دادپـەروەری ئـەهلی وەفاو ئیحسانی دەربارەی هەژارو بێ کەسانیش کەسێکی راست و ئەمین ئەهلی چاکەی.
(٤) سەلا: بانگ کردن بۆ نوێژ.
تۆ لە دەستەو تاقمەی چاوەشاندا و لەبارەگای حەق هەر بانگی گشت دەکـەی لـەناو کـۆری بێ هۆشاندا سەرخۆشی و هەمدیسان مەست و هوشیاری.

تەلیعــەی فــەوجی ئــەوج و یــاوەری ســوڵتان و ســەرهەنگی
لەســـەربازانی مومتــازی لەســـەر عەســکەر قومانــداری[١].
چەخێر بوو دەوری بەزمت بێ سـەدای شـاباش چـاوەش چـوو
نەوای تارت چەنێ تـاربوو دەمـی پێـك سـاز نـەهات بـاری[٢].
نــەوەك مــن دوورە رێ بــێ چــاوەڕێ مــاوم لەبــەر چــاوان
لەدەس چووم لەپێ کەوتووم بەسـەر زینـدووم بـە بیمـاری[٣].
نەقورعــەی مــن لــەجیبی جامەخانــەی مەرحەمــەت دەرهـات
نەروقعــەی تــۆ بــەرەسمی توحفــە دیـداری بــووە دیـاری[٤].

---

(١) تەلیعە: پێشڕەو، فەوج: کۆمەڵ، ئەوج: شوێنی بلند.
کۆمەڵ کۆمەڵ و دەستە دەستە دێن تۆش پێشڕەویانی و لەبەرزترین پلەی هەر تۆ یاوەری و سولتان و سەرهەنگی لەنێو سەربازانیشدا گەلێك چاپووك و دیاری لەسەر سەربازانیش تۆ فەرماندەیانی.

(٢) سەدا: دەنگ و ئاواز، شاباش: ئەو دیارییەی دەدرێتە زورنا لێدەر لەشاییدا، چاوەش: زورنا لێدەر، نەوای تـار: دەنگی تـاڵی مۆسـیقا، تـار: تـاڵ، پیـك: ئامێرێکـە لـەقامیش دروست دەکرێت و لەناو زورنا دادەنرێت بەهەوا دەنگی لێوەدێت.
چ خێربوو دووری ئەو بەزم و رەزمەت بەبێ دەنگ و ئـاوازی شاباشـی چـاوەش بـوو دەنگـی ئامێری تاری مۆسیقا گەلێك تاڵ بوو چونکە پیکەکە ساز نەکرابوو.

(٣) نـەوەکو وەکـو مـن رێگـای دووربێـت هـەر لەچـاوەڕوانی دام لەبـەر چـاوان دیـارم بـەهۆی ئەوەشەوە لەدەست چووم و لەپێش کەوتوم تـەنها بەسـەر زینـدووم ئـەگینا ئـەوا مایمـەوە بەنەخۆش یەك کەوتوویی.

(٤) قورعە: بە هەڵبژاردن تیروپشك، روقعە: نامە–جۆرە خەتێکە.
بەتیرو پشك لەباخەلی مندا جامە دەرهـات کەوتـە نێـو خانـەی مەرحەمەتـەوە بـەهۆی ئـەو نامەوە کەتۆ بەشێوەیەکی رەسمی ناردت بـۆمن بـووە شـتێکی گـەلێك بـەنرخ ئـەوە بـووە گەورەترین دیاری.

دراهـــم ســـەرفی مـــەمنوع و ئیضـــافـــە جـــورمی مفتـــوح
لەبـــەختی رەش کـــەوتم روو ســـورو مـــن روو زەردی[١].
کـەتۆش هـیچ بـووی، وەکـو مـن بـا لەمـەولا روو لەوەلاکـەم
بەخوا غـەیری مـن و تـۆ وەک مـن و تـۆ بـوون مـەددکاری[٢].

---

(١) دراهم: کۆی درهەمە—پارە، سەرفی مەمنوع ئیضافە: بابەتی نەحوی عەرەبی.
مەسەلەی دراهم واتە پارەو سەرفی مەمنوع شتی دیکە بونە مایەی بەختی رەشی مـن بـەڵام ئێستا شوکر بەختی رەشم لەسەر لاچووە و ئێستا روو سووری دنیاو قیامەتم.
(٢) لەمەولا: لەمەودوا، لەمەولاکەم: روو لەخوا بکەم، مەدد: یارمەتی دار.
کەتۆ هیچ بووی وەکو مـن بـا لەمـەودوا روو لـەخوای گـەورە بکـەین چـونکە بەغـەیری خـوا کەسی دیکە وەکو من و تۆ نابیتە یارمەتی دەری.

پیربـــــووم و ژیـــــر نـــــەبووم بـــۆ تەجرەبـــەی کـــاران
بـــــارانی فرمێســـــکم بارانـــــد لـــــەدوری یــــاران[1].
ســــەرتاپام شـــین کـــرد ســــەوزەی رووی گـــوڵزاری
ئـــاوی چـــاوم ســـوور بـــوو بـــۆ ســـەروی جۆبـــاری[2].
لەخـــــــەوی غەفلـــــــەتا هاتمـــــــەوە بێـــــــداری
دیســـــانەوە چـــــوومە ســــــەر شـــــیوەن و زاری[3].
تـــبۆ ئەنۆشـــــی ســـوحبەت و رازی شـــــەوی وەســـلت
تـــــۆ دەنیشــــــی فیرقـــــەت و زاری رۆژی فەســـــلت[4].

---

(١) تەجرەبە: ئەزموون، یاران: برادەران و خۆشەویستان.
پیربوم و کەوتمە ساڵەوە تۆزێك عەقڵ فێرنەبووم و ژیری فێرنەبووم لەکەسانی خاوەن ئەزموون و دنیادیدە بۆیە ئێستا پەشیمان بوومەتەوەو فرمێسك دەبارێنم هەروەکو باران ئەویش لەدوای دۆست و خۆشەویستانەوە.
(٢) سەرد: درەختێکی گەڵا باریکەو هەمیشە سەوزە، جوبار: جۆگەلە زێی بچووك.
سەرتاپای تەمەنم هەر شین کردن بوو بۆ رووخساری کە هەروەکو گوڵزار وایە ئاوی چاویشم سوور هەڵگەڕا و بووە جۆگەیەك بۆئەوەی قەدی جوانی باریکی کە وەکو دار سەرو وایە هەتا ئاوی بدات هەربەو ئاوەش بۆیە هەردەم سەوزە.
(٣) غەفلەت: بێ ئاگایی، بێداری: بەئاگا هاتنەوە، شیوەن و زار: شیوەن و گریان.
لەخەوی بەئاگایدا بەخۆ هاتمەوە و کەوتمەوە سەر هۆش خۆم، کاتێك بەئاگا هاتمەوە دیسان کە کەوتمەوە سەر شیوەن و گریان.
(٤) سوحبەت: هاوڕێیەتی و تووێژ، فیرقەت: دووری جیابوونەوە، فەسل: لێك دابڕان.
ئەتۆ هاوڕێیەتی وتووێژ دەنۆشی و رازەکانی شەوی بەیەکگەیشتن دەدرکێنی دیسان تۆ دەنۆشی دەردی دووری و جیابوونەوەو شین و گریانی رۆژی لێك دابڕان دەنۆشی.

بـــه پـــەیکانی مـــوژەت چـــەند جـــارت پێکـــاوم
لـــــەمیحرابی ئـــــەبرۆت بەســـــتم و گـــــیراوم[1] .
تـــۆ وە ئەگریجـــەی خـــاوت تـــۆ وە زولفـــی لاولاوت
بـــەبێ دانـــەی خاڵـــت مەخـــەرە نێـــو داوت[2] .
بـــه پـــەرژینی زوڵفـــت رووی گوڵـــت شـــاردەوە
دڵـــم نـــارد بـــەدیاری.. بۆچـــیت نـــاردەوە[3] .
یـــاخوا بـــێ قـــەزابی لـــوتفی تـــۆ هەروایـــە
درێغـــیم لـــێ ئەكـــەی بـــۆ تاقـــە هەودایـــە[4] .

---

(١) پەیکان: سەرە تیر.
چەند جار بەسەرە تیری مووی برژانگەکانت جەرگ و دڵمت پێکاوە ئێستا جووتە برۆکانت هەردوو میحراب وایە لەوێدا من بەستاوەتەوە منت گرتووە.
(٢) زولف: کەزی= بسك.
سوێند بەپەرچەمی خاوت و بەهەردوو کەزیت کە وەکو لاولاو شۆڕ بوونەتەوە وە بێ دانەی خاڵت من بەبێ گوناه مەخەرە داوی خۆتەوە.
(٣) پەرژین: شورە بەدەوری باخدا درووست دەکرێت.
زولفەکانت شۆڕ کردبۆوەبەسەر روومەتەکاندا، روومەتت گەش و جوان هەروەکو گوڵ وایە جا زولفەکانت کردە پەرژین بۆ رووی گوڵت و گوڵەکان شاردرانەوە منیش لەبری ئەوە دڵم نارد بەدیاری بۆتۆ، بۆ قبووڵت نەکردو بۆت گەڕاندمەوە.
(٤) هەودا: تاڵەموو.
یاخوا بێ قەزاو بێ وەی و سەلامەت بی تۆ بەرامبەر بەمن لوتفت هەروایە، بەڵام ئێستا دەڵێم درێغی و کەمتەرخەمیم لێ نەکەی بۆ تاڵە موویەك، رەوانە ئەگەر تالە موویەکیش بنێریت بۆمن هەر بەزۆری تێدەگەم.

تۆ وە جامی لەب ریزت تۆ وە غەمزەی خوێن ڕێژت
تۆ وە دەست پارێزت بابەس بێ گریزت[1].
تۆ وە ریزەکەی زارت تۆ وە چاوەکەی بازت
تۆ وە تیرەکەی نازت بەس بێ گیرو گازت[2].
لەبەر جلوەت مردم نیقابی رووت لادە
لەبەر عیشوەت مرم چاە پیاڵەی بادە[3].
ئاورێکم لێ وەدەوە حەیاتم تازەکە
جەرگت پارە کردم بەتیرە تازەکە[4].
بەوەعدەی خیلافت گۆی سەرت شکاندم
بەچۆگانی زولفت دڵت لێ فڕاندم[5].

---

(١) لەب: دەم، غەمزە: ناز، قسەکردن بەچاو و برۆ.
سوێند بەو جامەی بەسەر لێوتەوەیەو دیسان سوێند بەو چاوەی کە بەنازەوەقسەی پێ دەکەی و دەمکوژیت و دەبێتە هۆی خوێن ڕشتن توخوا دیسان سوێند بەو دەستە کە خۆت دەپارێزی بابەس بێت خۆ لادان لەمن چیتر بەرگە ناگرم.
(٢) سوێند بەگریان و شیوەنت کە فرمێسك لەچاوە جوانەکانت دێتە خوارێ هەر دەڵێی چاوی بازە سوێند بەو تیرەی کە بەناز دەهاوێی بەسە هەراو هۆریا.
(٣) نیقاب: پەچە، عیشوە: باز فرۆش، بادە: مەی.
لەبەر خۆپیشان دان و ئاشکرا کردنی چاوەکانت بمرم بەسە ئیتر ئەو پەچەیە لەسەر رووت لادە دیسان لەبەر نازو عیشوەت بمرم چاوت هەر دەڵێی پیاڵەیەو پڕە مەی و منی پێ مەست دەکەی.
(٤) تەنها ئاوڕێکم لێ بدەوە چونکە بەئاوڕدانەوەی تۆ ژیانم نوێ دەبێتەوە جەرگت پارچە پارچە کردم ئەو تیرەی کە تازە بۆت هاوێشتم جەرگی پێکام.
(٥) وەعد: پەیمان، خیلاف: جیاوازی، وەعدەی خیلافت: وەعدت نەگەیاندە جێ، چۆگان: گۆچان.
بەو پەیمانەی کە نەت گەیاندە جێ سەرت شکاندم بە زولفت کەوەکو گۆچان چەماوەتەوە کە هێندە جوانە و دلڕفێنە دڵت بردم.

تــــۆ وه تاریکــــه شــــەو، هیجرانـــــی چـــــەند ســــاڵەم
تــــۆ وه رۆژی روونـــــاک کـــــۆچ مـــــاڵ ئــــەو ماڵــــەم[١].
تــــۆ وه بـــــالأی عەرعـــــەرت زولفــــت لاولاوکــــــه
تــــۆ وه نیگـــــای دولبـــــەرت جـــاریٚ لـــیٚم لاوەکــــه[٢].
تــــۆ وه دەروونـــــی گــــەرم و تــــۆ وه هەناســـەی ســـەردم
تــــۆ وه دڵــــەی پـــڕ دەرد و تــــۆ وه روخســـاری زەردم[٣].
لەســــەر شــــانی دڵـــم بـــــاری غـــــەم خـــوار مەکــــه
تــــۆ راســــتی بالاّکـــــەت، شــــەدەکەت لار مەکـــــه[٤].
ئــــەمجار نۆبــــەی عەکســــی تەجــــەللای ســـــیفاته
ئــــەمجا نۆبــــەی جلــــوەی جــــامی خــــۆش ســــەفایه[٥].

---

(١) تۆ بەتاریکە شەو کەچەند ساڵە لێم جیابوویەوە بەتەنها دەژیم رۆژیش کە رووناك دەبێت ئەو ماڵ دەکەم و بەدواتا دەگەڕێم و ناتدۆزمەوە.

(٢) عەرعەر: قەدو باڵای دولبەر.
تۆ کە ئەو بەژن و باڵایەت هەیە کەهەر دەڵێی داری عەرعەری توخوا زولفو گەزیزەکانت لاولاو بکەو بەوێنەی جوانی دولبەرت هەر بۆ جارێك ئەو زولفە لادەو رووخسارت ببینم.

(٣) تۆ دڵ و دەروونێکی گەرم و منیش بەهەناسەی سارد تۆ بەدڵێکی پڕ دەردو غەم و خەفەت و منیش بەرەنگ و رووخسارێکی زەرد لەناو دڵەی پڕ خەفەتی تۆ.

(٤) شەدە: ئەو پارچە پەرۆکەیە کە جاران ئافرەت لەسەریان دەکرد وەکو جەمەدانی پیاوان.
غەم و خەفەتێکی گەلێك زۆر لەسەر شانمە و تۆش باری ئەو غەمە خوارمەکە سوێند بە قەدو باڵای راست چی دیکە شەدەکەی سەرت خوارمەکە و مەمکوژە بەلەنجەو لاری شەدەی سەرت.

(٥) تەجەللا: ئاشکرابوون و دەرکەوتن، جلوە: درەوشانەوەی نووری خواناسان.
ئێستا نۆبەی ئەوەیە هەرچی سیفات هەیە بەدیاری بخەین و ئاشکرای بکەین بە پێچەوانەی جاران کە بەنهێنی دەمانهێشتەوە ئێستا نۆرەی ئەوەیە کە درەوشانەوەی نووری خوا دەربکەوێت جامی خۆشی سەفایە بێتە گۆڕێ.

وەك خـــــەتی مشـــــكینت تاكـــــەی پەرێشـــــانی
وەك پـــــەرگاری زولفـــــت تاكـــــەی ســـــەرگەردانی[1] .
روو زەردی ئیشـــــراقی خورشـــــیدی جـــــەمالم
شـــــەرمەندەی بارەگـــــای زولـــــف و خـــــەت و خـــــاڵم[2] .
ئـــــاوارەی وەتـــــەن و غـــــەریبی كـــــۆی یـــــارم
میحنـــــەت زەردەی دەســـــتی رەقیـــــب و ئـــــەغیارم[3] .
تـــــۆ وە كەعبـــــەی مـــــورادت قیبلـــــەی دنیـــــاو دیـــــنم
جـــــاریّ دەركـــــەوە بـــــا بـــــاڵات ببیـــــنم[4] .
مـــــەقامی عاشـــــقان ســـــەدای قـــــەد قامەتـــــە
بەنـــــەوای حـــــەزینم راســـــتی قیامەتـــــە[5] .

---

(١) خەتی موشكین: مووی تازە رواوی رەش و بۆن خۆش، پەرگار: پەرگال بۆ راكێشانی بازنە بەكاردێت، سەرگەردان: دەربەدەر ئاوارە، پەرێشان: پەرش و بڵاو.
وەك ئەو مووە تازە رەش و بۆن خۆشانەی كە لەرووی گەنجان هەیە پەرش و بڵاوە دەبی هەروەك پەرگال بسك و زولفت كەلول لول و بازنەیە تاكەی سەرگەردان و ئاوارە دەبیّ.
(٢) خورشید: رۆژ، ئیشراق: رووناك بوون، جەمال: جوان، شەرمەند: شەرمن.
من روو زەردی رووناكی بوونی ئەو رۆژە جوانەم كەتیشكی زێرینی پەخش دەكات بەسەر دنیادا دیسان شەرمەزاری بارەگای بسك و كەزی خەت و خاڵم.
(٣) میحنەت زەدە: دەردو بەڵا و پەرێشانی، رەقیب: دوژمن، ئەغیار: بێگانە.
ئاوارە و دەربەدەری نیشتمانم دوورو غەریبی دۆست و برادەرانم دەردو بەڵا پەرێشانی دەستی دوژمن بێگانەم.
(٤) مورادت: هیوا—ئامانج.
سوێند بەكەعبە كە هیواو ئامانجتە تۆ قیبلەی دین و دنیام واتە تۆ رێگا پێشاندەی رێگا ئاسانكاری دین و دنیامی، جارێك دەركەوەو خۆت نیشان بدە با قەدو باڵات ببینم.
(٥) سەدا: دەنگ، قەد قامت: قامەتی نوێژكردن، نەوا: دەنگ ئاواز، حەزین: غەمناك.
شوێن و مەقامی دۆستانی خوا هەر دەنگی قەد قامەتە بەدەنگە و ئاوازی غەمباراویم راستی وەستانی رۆژی قیامەتە.

بەشــــێوەی شــــیرینت ســــەد فــــەرهاد کەیلـــــە
هــــەزار مــــەجنون ســــەودای زولفــــی لەیلــــە[١].

بـــــۆچ هــــەر ئـــــەمن مــــەخموری بــــادەی مەســــتم
یــــا هــــەر مــــن سەرمەســــت جــــامی ئەلەســــتم[٢].

لـــــەلای خـــــۆی (حـــــەریق) شــــەمعی رووی خوبــــانم
گــــیرۆدەی زنجــــیری پیرەکــــەی بورهــــانم[٣].

---

(١) کەیل: پڕ لێواو لێو.
هەرکە شێوەی شیرینت بەدیار دەکەوێت سەد فـەرهاد لێـواو لێـوی عەشـقی دەبێـت هـەزار مەجنونیش عەشقی زولفی لەیلا دەبێت.

(٢) ئەلەست: بەشـێوەی پرسـیار خـوا دەفـەرمووێت: ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ﴾ مرۆڤـەکانیش وەڵامیـان دایەوە ﴿قَالُواْ بَلَىٰ﴾ مەخمور: سەرخۆش، بادە:مەی.
لەبەرچـی هـەرمن سەرخۆشـی مـەی و بـەو مەیـە سـەرخۆش و مەسـتم یـان هـەر بەتـەنها سەرمەستی ئەو پەیمانەم کە ڕۆژەکەی ئەلەست بە خوامان دابوو.

(٣) خوبان: جوان شۆخ، شەمع: مۆم، پیر: شێخی تەریقەت– شێخ بورهان یوسف شمس الـدین پیری حەریقی.
لەلای خـۆی بـە مەزەنـدەی خـۆی حـەریقی مـۆمی روو گـەنج و جـوان و شـۆخانە گـیرۆدەو عەودالّی زنجیری پیرەکەیەتی کە شێخ یوسف شمس الدینە.

# چوارینەکان

چـــۆن بەســـەرکەم زەرفی ئـــەو قەومـــە بەســـونەیە
جـامی عەیشـی ئـەکل و شـوربی باکیـان بەسـوینەیە[١].
خـۆ لـە قـورنی هەرکەسـێ ئـەمڕۆ لـەقوردا نـەبێ
دەس لـەخۆی بـەردا کەسـێ بـەردی زەلامـی پـێ نەیـە[٢].

کاغـەزی وا زۆر دەهـاتن زوو لـە هەورامانـەوە
وەک گـەڵا تـاڵو هـەمووومان خسـتە ئاگردانـەوە[٣].
دوێـنێ دەتگـووت یوسـفی سـدیقی میسـری دیـن ئـەوە
ئـەمڕۆ بـات داوە، چ عـەیبێکی هەیـە بادانـەوە[٤].

---

(١) عەیش: خۆشیو بەختیاری، ئەکل و شورب: خواردن و خواردنەوە.
چۆن بێنمە بەرچاو بارو زروفی ئەو قەومە کە هێندە بەسونەیە، جامی خۆشی و کامەرانی و بەختیاری تەنها خواردن و خواردنەوە باکیان بەهیچ شتێك نییە سوینە نەبێت.

(٢) خۆی لە قوڕ نێت هەرکەسێك خۆی لەقوڕ نەناوە، دەست لەخۆی بەردا و دەستی لەخۆی بشوات کەسێك بەردی گەورەی پێ نەبێت.

(٣) کاغەز: نامە، تالۆ: جۆرە دارێکە زوو دەسووتێت ئاگر دەگرێت.
جاران زوو زوو نامە لە هەورامانەوە بۆمان دەهات، ئەو کاغەزانە هێندە بایەخیان نەبوو دەمانخستە ناو ئاگردان لەگەڵ گەڵای تاڵو خۆمان پێ گەرم دەکردەوەو ئاگرمان پێ خۆشدەکرد.

(٤) یوسف ی راستگۆ: یوسفی کوڕی یعقوب سڵاوی خوایان لێ بێت.
هەتا دوێنێ دەتگووت ئاین هەر ئاینی حەزرەتی یوسفی راستگۆیە، کەچی ئەمڕۆ پێچەوانەی دوێنێ لەقسەکان پەشیمان بویەوە، جا ئەوە چ عەیبێکی هەیە باداوەو پەشیمان بوونەوە.

عیلمــی جــەلب و کەســبی دونیــا بۆتــە ئــەجزای کیمیــا
بــــۆمنی ســــەودا زەردە ســــەودایەکی ســــەمفونیا[١].
هــاو دەرس بــووم مــن لەگــەڵ زاهیــد لــە دیپاچــەی کتێــب
مــن نەگەیمــە فەســڵی تــەزویر ئــەو چــوو بــۆ بــابی ریبــا[٢].

عــەزیزم تــۆ دەزانــی مــن لەبــەر چــاوت کــەڕو گێــژم
لەبــەر ناپیــاوی خــەڵمکی تێدەگــەی موحتــاجی گوێدرێــژم[٣].
ســـوارنیم و پیـــادەم چـــۆن ئـــەبێ وەســـڵ و مولاقـــاتم
ولاٚغ دەست ناکەوێ هــەر بــۆ تەبــەروك خــۆ ســەر ئاوێــژم[٤].

---

(١) جەلب: راکێشان، ئەجزا: کۆی جزو بەش.
راکێشانی زانست و پەیداکردنی لەگەڵ کەسایەتی دنیا بۆتە بەشەکانی کیمیا بۆ کەسێکی وەکو منی سەودا سەر کە سەودای سەمفۆنیامە.

(٢) زاهید: خواترس: دیپاچە: سەرەتای کتێب، تەزویر: فرت و فێڵ، ریبا: ئیش کردن بۆ دنیاو غەیری خوا.
هاودەرس بووم لەگەڵ خواناسێك کە لەسەرەتای کتێب بووین من نەگەیشتمە بەشی تەزویر و فرت و فێڵ ئەو گەیشتە بەشی ریبا.

(٣) خۆشەویستم تۆ دەزانی من لەبەرتۆ کەڕم گوێم لەهیچ نابێت و گێژم و لە هیچ شتێك ناگەم ئێستا لەبەر ناپیاوی خەڵکی چاك بزانە پێویستم بە گوێدرێژەك هەیە بۆئەوەی پێویستەکانی خۆمی پێ جێبەجێ بکەم.

(٤) وەسڵ و مولاقات: بەیەکگەیشتن.
سوارنیم واتە سواری ولاٚغ نیم و بەپێی خۆم دەڕۆم کەواتە ناتوانم پێت بگەم چونکە دیارە پیادە وەکو سوارە خۆش ناڕوا لەرێگا ئەوەش هۆی ئەوەیە کە ولاٚغ دەست ناکەوێت هەر بۆ جارێکیش بۆ موبارەکی سواری ببم.

هـــەروەکو بیســـتومە بەینێکـــە لەئـــەم بـــەر ئـــەم بـــەری
بۆمـــەلای مزگـــەوتی ســـوور واچـــاکە تـــۆبی لەوبـــەری[١].
بـــێ لەحاشـــا بـــۆ لەگـــەڵ مـــن مەحکەمـــەی قـــازی دەچـــوو
کـــاکی سەردەشـــتی بـــە تەڕدەســـتی وەســـەر جێگـــا پـــەڕی[٢].

بەپشـــکێ رازییـــە قازیلەهـــەر مـــاڵی کـــە دووپشـــکە
لـــەماڵی خـــۆی لـــەبۆ خـــەڵکی هەمیشـــە حیســـە دووپشـــکە[٣].
بـــەڵێ مـــونعیم دەبـــێ وابـــێ خـــودا کـــا مـــاڵی ئـــاوابێ
نـــەوەک خـــەڵکی کـــە ماڵیـــان ژەهـــری مارونێشـــی دووپشـــکە[٤].

---

(١) هەروەکو گوێ بیستی ئەوە بویمە ماوەیەکە خـەریکی ئـەو بـەرو ئەوبـەری واتـە خـەریکی هاتووچۆکردنی ئەم بەرو ئەوبەری جا بۆ ئەوەی ببیە مەلای مزگەوتی سوور واباشـترە بۆتـۆ لەوبەربیت.

(٢) لەگەڵ مندا هەرخـەریکی هاتووچـۆ بوویت بۆئـەوەی لای قـازی دادگـایی بکـرێین جا بـرای خەڵکی سەردەشت زۆر بە تەڕدەستی لەسەر جێگادا پەڕی.

(٣) پشك: بەش حصە، دوو پشـك: دووبـەش، حیسـە: بـەش، مـونعیم:بـاوکی کـەریم قـازی کـە دووپشك پێوەی داوە.
قازی بەشی پشکێکە کەچی لەماڵی خەڵکی دووپشك پێوەی داوە لـەماڵی خـۆی کـە بیداتـە خەڵکی هەریەکە دوو پشکی پێدەدا.

(٤) بەڵێ کەسێکی وەکو مونعیم دەکرێ مەبەستی کەسێکی خوا پێداو بێت جگـە لـە قـازی مونعیم دەبێت ئاوا بەخشندە بێت لەماڵی خۆی ببەخشێت خـوا مـاڵی ئـاوا بکـات نـەك وەك ئەوەی خەڵکی بچێتە ماڵیـان ژەهـری دووپشـکی بـدرێتێ بـەهۆی ئـەوەی دووپشـك پێـوەی بدات.

بـــابێ کـــوڕێکی بـــوو، چ کـــوڕ، ئـــەربابی مەعنـــەوی
دەیگـــووت لـــەرووی نەســـیحەتەوە دایمـــەن بـــەوی[1].
وەک جـــەردەبێ، دە ڕۆڵـــە لەعـــەمری منـــت کـــەوی
نـــەی دەیتـــەوە بـــەمفتی ئەفەنـــدی گلنبـــوی[2].

چـــوومە جەرگـــەی ئـــەهلی دڵ جـــەرگێکی بـــێ داغـــم نـــەدی
نالـــەی بولبـــول لـــەباغا بـــێ ڤـــرە زاغـــم نـــەدی[3].
عالـــەمێکی پـــڕ لـــە ناســـاغ و یـــەکێکی ســـاغم نـــەدی
دوور لەمـــەردانی خـــوا غـــەیری قورمســـاغم نـــەدی[4].

---

(١) بـابێ: مەبەسـت بـاوکی شـاعیرە، کوڕێـک: مەبەسـت شـاعیر، ئـەرباب: گـەورەو بـەڕێز، نەسیحەت: ئامۆژگاری، دایمەن: بەردەوام، بەوی: بەئەو.
باوکێك کوڕێکی هەبوو بەڵام چ کوڕ کوڕێکی گەورەو بەڕێز لەرووی داناییـەوە هـەموو جارێـك ئەو باوکە هەموو کاتێك بەبەردەوامی ئامۆژگای کوڕەکەی دەکرد.
(٢) جەردە: ڕێگر، موفتی ئەفەندی: مەبەست عزیز موفتییە، گلنبوی: کتێبێکە جاران فـەقێیان لەدوا قۆناغی خوێندنیاندا لەمزگەوت دەیانخوێند باس لە علمی کلام.
دەکات وەك ڕێگربە ڕۆڵە لەعومری منت کەوی ئەو کتێبە کە گلنبوی یەو هی مـوفتی عزیـزە نەیدەیتەوە.
(٣) زاغ: قەڵەڕەش.
چوومە ناو ئەهلی دڵ ئەوانەی بەدڵ سەیری خەڵك دەکەن هیچ کەسێکم نەدیت کـە جـەرگی داغ نەکرابێت، لەناو باغیشدا هیچ نالەی بولبولێکم نەدیت کـە قرەقـری قەڵەڕەشـی لەگەڵدا نەبێت.
(٤) دنیا سەرتاپا هەموو ناساغە و کەس لەگەڵ کەس ساغ نییە هەرهەموو ناسـاغە، بێجگـە لـە مەردانی خواپەرستان ئەوانی دیکە هەرهەموو قورمساغن.

# تکاکان

لەعوزرا بوو مەلا بۆیە جوابی دا گووتی نادەم
ولاغ دەست ناکەوێ عەیبی نییە چش گەر منیش پیادەم[١].

سواری مەرەکەبی فکرم لەدەوری مولکی مەحاڵ
سواری تەوسەنی هیمەت نەما قحط الرجال[٢].

عەزیزم تۆ ئەزانی من لەبەر چاوت روو گێژم
لەبەر ناپیاوی خەڵکی تێ ئەگەی موحتاجی گوێدرێژم[٣].

تاڵ و شیرین پێکەوە نەم دیوە چا، نەبێ
هەرکەسێکی هەم نشینی چا نەبێ، پێت چانەبێ[٤].

---

(١) عوزر: داوای بورین لەئەنجام نەدانی کارێك.
شاعیر داوای گوێدرێژێك لەمەلایەکی هاورێی دەکات کە کاری خۆی پێ جێبەجێ بکات و دوایی بۆی بگەڕێنێتەوە کەچی کابرا عوزر دەهێنێتەوە کە ناتوانێت پێی بدات.
داوای ولاغێکم کرد لەمەلا کە بەئەمانەت پێم بدا کەچی عوزری هێنایەوەو نەیدا پێم دیارە قاتی ولاغەو دەست ناکەوێت هیچ عەیبێکی نییە گەرمن پیادەبم.

(٢) مەرکەب: هەرشتێك سواری ببی، مەحال: مستحیل، قحگ الرجال: قاتی پیاو.
سواری بیرو فکری خۆمم ئێستا ئەوەی هەمە تەنها فکرم و مولکی دنیام نییە بۆیە بڕوام هیمەتم بەو هەیە ئێستا قاتی پیاوە لەو سەردەمە.

(٣) خۆشەویستم تۆ دەزانی بۆچی لەبەر چاوی تۆدا هێندە گێژو وێژم با پێت بڵێم هۆیەکەی لەبەر ناپیاوی خەڵکە چونکە من ئێستا خاوەنی گوێدرێژ نیم.

گـوتم بوسـەم دەویٚ رووی خـۆم بـەئاوی رووت گـولاّو ناکـەم
گووتی بوسەت ئەویٚ شیٚتە ئەمنیش رووی خۆم گـلاّو ناکـەم[٢].

سوپاس بۆخوا
لەشەرحی بوومەوە
سەرلەبەیانی ٢٠١١/٢/٢١
بەرامبەر ١٨ ربیع الاول ١٤٣٢

---

(١) چا: شلەیەکە دەخورێتەوە لەگەڵ شەکر، پێت چانابیٚ: لات باش نابێت.
نەمدیوە هیچ شتێك تـاڵ و شـیرینی کۆیـان بکاتـەوە جگـە لـە چـا نـەبێت، کـەخۆی تاڵـەو شەکری شیرینی تێدەکرێت، جـا هەرکەسـێك لـەکۆڕو مەجلیسـی چـا خۆرەوەکـان نـەبێت و لەگەڵیان هەڵنەستێتو دانەنیشێت لات باش نەبێت.
(٢) بوسە: ماچ، گلاّو: سەگ دەمی لەهەر شتێك بدات گلاّو دەبێت بۆ خاوێن کردنـەوەی دەبێـت ئەوشتە حەوت جار بشوریٚ جاری حەوتەم بە خۆڵ بێت.
گوتم ماچێکم بدەریٚ یا رووی خۆم بەئاوی رووت گولاّو نەکەم ئـەویش گـووتی شـێتە ماچـت دەویٚ چۆن رووی خۆم بەدەمی تۆ پیس و گلاّو بکەم!.

# ناوەڕۆك



## نەوزاد کەلهور

- لەساڵی ١٩٦٠ ز لە هەولێر لە دایك بووە.
- دەرچوی کۆلیژی پەروەردە ، بەشی پەروەردەی دەرونزانیە.
- ئەندامی یەکێتی نوسەران و سەندیکای ڕۆژنامەنوسانی نێودەوڵەتیە.

### چاپکراوەکانی

١- ڕەهەندی ئایین لە شیعری کلاسیکی کوردی .
٢- گەشەکردنی منداڵ.
٣- پینەدۆز و دراوسێکەی.
٤- زێوەر – لێکۆڵینەوەو لێکدانەوە.

نوسینگەی تەفسیر
بۆ بلاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
Mob:00964 750 460 51 22
Tel: 0964 750 25 18 138
www.tafseer-pub.com
tafseeroffice@yahoo.com

Designer